دەزگای چاپ و پەخشی
نارین

ڕێگای کامەرانی (کتێبی: چۆن تەوبە بکەم؟)

نووسینی: **علی خان**.

چاپی: نۆیەم، (هەڵە چنی کراوە و زۆر بابەتی بۆ زیاد کراوە).

ساڵی: ٢٠٢٠ ز.

ژمارەی سپاردنی (٨٧٩) پێدراوە لە وەزارەتی ڕۆشەنبیری



دەزگای چاپ و پەخشی
نارین

ناونیشان:
هەولێر، بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

مۆبایل:
009647504064610

وێب سایت:
www.nareenpub.com

ئیمێڵ:
nareenpub@gmail.com

علي خان

# ڕێگای کامەرانی

## کتێبی: «چۆن تەوبە بکەم؟»

چاپی نۆیەم
(چاپێکی بۆ زیاد کراوە)

دەزگای چاپ و پەخشی
نارین

# پێشەکی چاپی نۆیەم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام علىٰ نبي الله الأمين، وعلىٰ آله وأصحابه، أما بعد:

خوێنەرانی بەڕێز! ئەمە چاپی نۆیەمی کتێبی: «چۆن تەوبە بکەم؟»، کە چاپێکی هەڵە چنی کراو و بۆ زیاد کراوە، ناوەکەشی گۆڕدراوە بۆ: «ڕێگای کامەرانی»، چیرۆکی ناوگۆڕینەکەش، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جارێکیان بە دیاری بەخشیمە کەسایەتیەك، ئەویش دیارە ئیحراج بوو ناونیشانەکەی بینی، هەستی کرد من پێی دەڵێم: تەوبە بکە! بۆیە پێی وتم: من لە زووەوە تەوبەم کردووە! هەروەها جارێکی دی کەسێك لە ئەوروپاوە تەلەفۆنی بۆ کردم وچیرۆکێکی نزیك لە ئەوە ڕویدا. هەروەها یەك دوو کەسێك هەستیان بە ئیحراجی دەکرد لە کتێبخانە بڵێن: کتێبی: «چۆن تەوبە بکەم»م دەوێت؟ جا بۆم دەرکەوت بە دەر لە ئەو چیرۆکانە، ناوی کتێبەکە بگۆڕم بۆ ناوێك هیچ کەس شەرم نەکات وهەست بە ئیحراج بوون نەکات بە خاوەن کتێبخانەیەك بڵێ: فلان کتێبم دەوێت.

ئەم چاپی نۆیەمەش بڕێك باس وپرسی گرنگی تری بۆ زیاد کراوە، داواکارم لە خوای گەورە بیکاتە مایەی زیاد کردنی چاکەکانمان ولە تاوانمان ببورێت، وئیخلاصم پێ بدات بە مەزنی ومیهرەبانی خۆی..

# دەستپێك

لەبەر ئەوەی خوای مەزن لە قورئانـدا فـەرمان دەكـات بـە سـەرجەم موسڵمانان كەوا تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆی لای و ئەفـەرمویٚ: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ [النور:٣١]، ((تەوبە بكەن وبگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیمانداران هەر هـەموتان، بـەڵكو سـەرفراز ببن)).

هـەروەها بەنـدەكانی كردۆتـە دوو بەشـەوە: تۆبـەكار و سـتەمكار و هەرگیز سێیەمی بۆ نیە، دەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾﴾ [الحجرات:١١]، ((وهەركەسێك تەوبە نەكات، ئا ئەوانەن ستەمكارەكان)).

هەروەها لەم ڕۆژگارەشماندا، خـەڵك زۆر لـە ئاینەكـەی خـوای گـەورە دووركەوتونەتەوە، دەبینی سەرپێچی و خراپە و فەساد هەموو شـوێنێكی گرتۆتەوە، تەنانەت وای لیٚ هاتووە یەكێك نەماوەتەوە پرشی خراپەی بەر نەكەوتبێت، مەگەر ڕەحمی خوای بە بەزەیی.

بەڵام سوپاس بۆ خوا كۆمەڵێكی باش لە خـەوی بـیٚ ئاگـایی وتـاوان بێدار بوونەتەوە و هەستیان كردوە كـە چـەند كەمتەرخـەمن لـە ئاسـت خوای میهربان، بۆیە پەشیمان بوونەوە، هەندێكی تریش بێـزار بـوون لـە ژیانی تەنگ وتەسكی وناڕەحەتی، ئەوەتا بە دوای ڕێگەیەكـدا دەگـەڕێن

بۆ ئەوەی لــە تاریکســتان دەربچــن بــەرەو نورســتان، بــەڵام لــە ڕێگــادا شتانێکیان دێتە پێش وا دەزانن ڕێگرە لە نێو ئەوان و تەوبەدا...

جا ئەمە کورتە باسێکە لەو بارەیەوە، داواکــارم لــە خــوای بەخشــندە ومیهرەبان، قبوڵ کاری تۆبەی تۆبە کاران، تەوبە لە من وئێــوە وهــەموو موسڵمانێك قبوڵ بکات.

لە کاتێکدا ئەم نامیلکەیە دەخەمە بەردەستتان، خوا ئــەزانێت چــەند خۆم بە کەمتەرخەم دەزانم، چەند شــەرم دەمگرێــت لــە بــارەی تەوبــەوە بدوێم، جارێك تەوبە دەکەین سەد جار تاوان دەکەین، جارێك بە فەرمانی خوای میهرەبان دەڕۆینە ڕێوە سەد جــار شــەیتان گۆڵمــان دەدات. ئــاخر تەوبە کردن پیشەی هەمیشــەیی پێشــینی چــاك وپیــاو چــاکانمان بــووە، بەرنامەی کاری ڕۆژانەیان بووە، هەربۆیە هەقی خــۆی بــوو پیــاوی خــۆی بێتە مەیدان وگوتاری خۆی بدات ولاپەڕەکان ڕەش بکاتەوە، هەر بۆیە پڕ بــە دەمــم ڕای دەگەیــەنم: ئەمــە لــە ڕوانگــەی هەســت کــردن بــە بەرسیاریەتیەوە نوسراوەتەوە نەك لە ڕوانگەی ئەهلیەتەوە.

جا ئەم چەند دێڕە دیاری منە بۆ هاو دەردەکانی هاوڕێم:

بۆ ئەوانەی بە دەست تاوانەکانیانەوە گیرۆدە بوون...

بۆ ئەوانەی تاوانەکانیان بەندی کردون...

بۆ ئەوانەی ستەمی زۆریان لە خۆیان کردوە...

بۆ ئەوانەی زۆرێك لە تاوان ئەنجام دەدەن و کەم جار تەوبە دەکەن...

بۆ ئەوانەی زۆر جار بڕیاری تەوبە کردن دەدەن... بەڵام دوای دەخەن...

بۆ ئەوانەی تاوانەکانیان لەو پەروەردگارە بە ڕەحمە دوری خستونەتەوە...

بۆ ئەوانەی تاوانەکانیان بووە بە مایەی دواکەوتنیان لە کاروانی پیاو چاکان...

بۆ ستەمکارێلێکی تاوان پیشەی هاو شێوەی ئێمە...

**هەروەها بۆ:**

ئەوانەی هیچ دەرگایەکی خراپە نەماوە لێیان نەدابێت...

ئەوانەی لە تەمەنیان قورئانیان نەخوێندوە...

ئەوانەی لە تەمەنیان سوژدەیەکیان بۆ خوا نەبردوە...

ئەوانەی لە تەمەنیان تامی باوەڕیان نەچەشتووە...

ئەوانەی ئەیانەوێت بە ڕاستی تامی ژیان وکامەرانی بچژێن...

ئەوانەی زۆر تاوان بارن، واش ئەزانن چاکە کارن و هیچ خراپەیەکیان نەکردوە...

ئەوانەی بە دوای پڕ کردنەوەی کەلێنەکانی ژیانیاندا دەگەڕێن...

ئەمانە و جگە لە ئەمانیش... ئەم دیاریە پێشکەش دەکەم...

**بە هیوای ئەوەی:** پوچەڵ کەرەوەی پیلانەکانی شەیتانە مرۆیی و جنۆکەییەکان بێت کە دەیانەوێت کەس تەوبە نەکات، ئەوانەی بوونەتە بەر بەستی ڕێی تەوبە کردن وڕوو لە خوا کردن.

**بە هیوای ئەوەی:** ڕێ نیشاندەری تاوان بار بێت بۆ چۆنێتی تەوبە کردن، ڕێنمایی کاری تەوبە کار بێت بۆ چۆنێتی بەردەوام بوون...

**بە هیوای ئەوەی:** ئەو ئاوە سازگارە ساردە بێت کە لە دوای گەرما و شەکەتیەکی زۆر دەخورێتەوە...

**بە هیوای ئەوەی:** فێنکی دەرونەکان بێت...

لە بیرت نەچێت عیبرەت بە ڕێکی کۆتاییە... نەك کەم وکورتی سەرەتا..

دواکارم لە خوای گەورە، سوود بە من و برا و خوشکانم بگەیەنێت، ئەوەشی عەیبێکی تێدا دەبینێت بەخیلی نەکات لە ئامۆژگاری، ئەوەشی سودێکی لێ دەبینێت دوعایەکی خێر بکات، بەسم بێت خوا دوعایەکی خێری یەکێکتان بۆ من قبوڵ بکات.

هەر هەق و ڕاستیەکیشی تێدا بینرا ئەوە تەنها لە خوای مەزنەوەیە و هەر ئەو خاوەن فەزڵ و بەخششە، هەرچیش جگە لەوەی تێدا بوو، ئەوە لە نەفسی خۆم و شەیتانەوەیە و خوا ﷻ و پەیامبەرەکەی ﷺ لێی بەرین.

پەناش دەگرم بەخوا لەوەی بە بیری ئێوەی بێنمەوە و خۆم لە یادی بکەم. والله أعلم. وصَلِ اللَّهُم عَلَىٰ محُمَد خاتم النبيين وَآلِه وَالحَمْدُ لِله رَبّ العَالمِين.


هەزاری لێ خۆش بوونی خوا

**علي خان**

خوا خۆش بێت لە خۆی و دایك و باوكی و موسڵمانان

مزگەوتی قازی محمد / كەلار - 23 ربيع الأول 1431

info@ali-xan.com

٠٠٩٦٤٧٧٠١٢٣٤١٥٧

# هەموومان هەڵە دەکەین

زۆربەی خەڵکی بەها و هەقیقەتی تەوبە نازانن، چ جای ئەوەی پێی هەستن، ئەوانەشی بەهای تەوبە دەزانن، نازانن ڕێگای بەدەستهێنانی چۆنە، ئەگەریش ڕێگاکە بزانن چۆنێتی دەست پێکردنەکەی نازانن؟

جا وەرە لەگەڵماندا با بزانین هەقیقەتی تەوبە و ڕێگای بەدەستهێنانی چییە و چۆنە؟ بەو ئومێدەی لێی تێبگەین و بە ئامانجەکەی بگەین. سەرەتاش ئەبێ ئەوە بزانین کەوا:

**برای خۆشەویستم.. خوشکی بەڕێزم**

هەموومان تاوانبارین، هەموو هەڵەکارین، جارێك ڕوو لە خوای گەورە دەکەین و چەندین جار ڕوو وەردەگێڕین، تاوێك هەست بە چاودێری خوا دەکەین و تاوانێك بێئاگایی باڵمان بەسەر دەکێشێ، بێ هەڵە نابین، هەر دەبێت هەڵەمان لێبوەشێتەوە، نە من و نە تۆ مەعصوم نین، پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، فَخَيْرُ الخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ، وَلَوْ أَنَّ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَيْنِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَىٰ لَهُمَا ثَالِثًا، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ» «هەموو

ئادەمیزادێك زۆر هەڵە دەكات و هەڵە كارە، باشترینی هەڵەكارانیش تۆبە كارانن»[1].

سەهو و كەموكورتی لە سروشتی مرۆڤن، لە گەورەترین نیشانەكانی ڕەحمەتی خواش بۆ مرۆڤ ئەوەیە: دەرگای تەوبەی بۆ كردۆتەوە، فەرمانی پێ كردووە هەر كە تاوانێكی تووش بوو سەرپێچیەكی ئەنجامدا، پەشیمان بێتەوە و ڕوو لەو بكات و بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو. ئەگەریش ئەم ڕەحمەتە فراوانەی خوای مەزن نەبوایە، مرۆڤ دەكەوتە ناڕەحەتی و تەنگیەوە، هیممەتی لاواز دەبوو لەوەی نزیك بێتەوە لە پەروەردگارەكەی، بێ هیوا دەبوو بە لێ خۆشبوون و میهرەبانی دروستك ارەكەی.

بەڵام ئەمەش نابێت وا بكات بە كەم تەماشای تاوان بكرێت.

۞ ۞ ۞

(١) أخرجه الترمذي في «جامعه» (٢٤٩٩)، وابن ماجه في «سننه» (٤٢٥١)، والدارمي في «مسنده» (٢٧٦٩)، وأحمد في «مسنده» (١٣٢٤٩). قال الحاكم: «هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ»، وحسن الألباني.

# نابێت بە کەم تەماشای تاوان بکرێت

**برای خۆشەویستم.. خوشکی بەڕێزم**

یەکەکێك لە گەورەترین نیشانەکانی لێ بوردەیی و لێ خۆشبویی خوای مەزن ئەوەیە: دوای ئەنجامدانی تاوانەکە و پێش نوسینی لە لەلایەن فریشتە بەڕێزەکانەوە، ماوە و مۆڵەتێکی پێ داوین تا پەشیمان ببینەوە و نەنوسرێت لە سەرمان، هەروەك پەیامبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەموێت: «إِنَّ صَاحِبَ الشِّمَالِ لِيَرْفَعُ الْقَلَمَ سِتَّ سَاعَاتٍ عَنِ الْعَبْدِ الْمسْلِمِ الْمخْطِئِ أَوِ الْمسِيءِ، فَإِنْ نَدِمَ وَاسْتَغْفَرَ الله مِنْهَا أَلْقَاهَا، وَإِلا كُتِبَتْ وَاحِدَةً»[1]. «فریشتەی دەستە چەپ بۆ ماوەی شەش سەعات -سات- قەڵەم لەسەر ئەو موسڵمانە هەڵ دەگرێت کە تاوانێك یان خراپەیەك ئەنجام ئەدات، جا ئەگەر پەشیمان بوەوە و داوای لێ خۆشبونی لە خوا کرد ئەوە لەسەری ناینوسێت، وەگەرنا بە یەك خراپە دەنوسرێت».

---

(١) أخرجه الطبراني في «الكبير» (٧٧٦٥، ٧٧٨٧، ٧٩٧١)، وأبو نعيم في «حلية الأولياء» (٦/ ١٢٤)، والبيهقي في «شعب الإيمان» (٦٦٥٠). قال أبو نعيم عن الحديث: «غريب من حديث عاصم وعروة، لم نكتبه إلا من حديث إسماعيل بن عياش». وقال العراقي في: «المغني» (ص: ١٤٩٥): «أخرجه البيهقي في «الشعب» من حديث أبي أمامة بسند فيه لين». وقال الهيثمي في «المجمع» (١٠/ ٢٠٧): «رواه الطبراني بأسانيد، ورجال أحدها وثقوا». وحسنه الألباني في (١٢٠٩).

ئەو سەعاتەش پیَ دەچێت هەر ئەم سەعاتە گەردونیە بێت کە لای هەموان زانراوە، پێشدەچێت ماوەیەکی کەم بێت لە شەو یان لە ڕۆژدا نزیکی ٤٥ - ٥٠ خولەك بێت.

هەروەها مۆڵەتێکی تریشی پێداوین، ئەویش دوای نوسین و پێش مردنە.

بەڵام کارەساتەکە لەوەدایە: زۆرێك لە خەڵکی ئەم زەمانە ڕێز لە خوای مەزن ناگرن، بە شەو و ڕۆژ بە جۆرەها تاوان و سەرپێچی ڕوو بە ڕووی خوای مەزن دەوەستنەوە، تەنانەت هەندێکیان زۆر بە کەم تەماشای تاوان دەکات، هەندێك خراپە هەر بە تاوان نازانێت، ئەڵێت:

جا تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم چی تێدایە؟!

تەماشای هەرچی حەرامە دەکات لە فیلم و زنجیرە دراما و گۆڤار و ڕۆژنامە خراپەکان؟!

هەندێکی تریان ئەگەر زانی شتەکە حەرامە، دەپرسێت: چەندێك حەرامە؟! تاوانێکی گەورەیە یان بچوکە؟! یان سزاکەی چیە؟!

جا کە حاڵی ئەو ڕۆژگارەی خۆمانت زانی تەماشای حاڵی پێشینای چاك وپیاو چاکانی دوای ئەوان بکە:

له صەحیحی بوخاریدا هاتووه له ئەنەسی کوڕی مالیکەوه، ئەڵێت: «إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالًا هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنْ الشَّعَرِ إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّهَا عَلَىٰ عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ مِنْ الموبِقَاتِ»[1]. «بەڕاستی ئێوه هەندێك کار دەکەن له تاڵه موو باریکتره له پێش چاوتان، بەڵام ئێمه له سەردەمی پەیامبەری خوادا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئا ئەو جۆره کارانەمان به تاوانه لەناو بەرەکان دەزانی».

هەر له صەحیحی بوخاریدا هاتووه له عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوه، فەرمویەتی: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَىٰ ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ، وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَىٰ ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَىٰ أَنْفِهِ فَقَالَ بِهِ هَكَذَا»[2]. «ئیماندار -ئەوەنده به گەوره له تاوانەکانی دەڕوانێت-، وەك شاخێك دێته پێش چاوی بەسەر سەریەوه بێت، هەمیشه دەترسێت دارمێت به سەریدا، بەڵام فاجر و خراپەکار -ئەوەنده به بچوك له تاوانەکانی دەڕوانێت-، وەك مێشێك دێته پێش چاوی به لای لوتیدا تێپەڕێت، به دەستەکانی ئاوهایەکی لێ بکات».

جا هەر کەسێك دەیەوێت له ئیمانداره ڕاستەقینەکان بێت، ئەبێت له تاوانەکانی بترسێت و زۆر وریاییان لێ بکات، به کەم و سوك

---

(١) أخرجه البخاري في «صحيحه» (٦٤٩٢).

(٢) أخرجه البخاري في «صحيحه» (٦٣٠٨).

تەماشایان نەکات، نەوەك بە هۆیەوە خوای دادگەر و کارساز سزای بدات.

بەڵێ ئیمانداری ڕاستەقینە زۆر بە گەورە تەماشای تاوان دەکات، لە خوای مەزن دەترسێت، بەڵام فاسق و فاجر زۆر گوێ بە تاوان نادات و بە کەم تەماشای دەکات. خوای مەزن بە فەزڵ و لوتف و کەرەمی خۆی لە ئیماندارە ڕاستەقینەکانمان بگێڕێت.

لە هەموو ئەمانەش ترسناکتر: ئەو فەرمایشتە پیرۆزەی پەیامبەری خوایە صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ کە لە موسنەدی ئەحمەددا هاتووە بە سەنەدێکی صەحیح، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە: «إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبَ، فَإِنَّهُنَّ يَجْتَمِعْنَ عَلَىٰ الرَّجُلِ حَتَّىٰ يُهْلِكْنَهُ، فَإِنَّ مَثَلَ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ كَمَثَلِ قَوْمٍ نَزَلُوا بِبَطْنِ وَادٍ، فَجَاءَ ذَا بِعُودٍ وَذَا بِعُودٍ حَتَّىٰ جَمَعُوا مَا أَنْضَجُوا بِهِ خُبْزَهُمْ، وَإِنَّ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ مَتَىٰ يُؤْخَذْ بِهَا صَاحِبُهَا تُهْلِكْهُ»[(١)]. «ئامان وریای تاوانە وردەکان بن -ئەو تاوانانەی کە بە کەم تەماشا دەکرێن و گوێیان پێ نادرێت-، چونکە بەرە بەرە لەسەر خاوەنەکەی کۆ دەبنەوە تا لە ناوی دەبەن، پاشان پەیامبەری خوا

(١) أخرجه أحمد في «مسنده» (٣٨٩٥)، وأبو داو الطيالسي في «مسنده» (٤٠٠)، والحميدي في «مسنده» (٩٨)، وابن أبي شيبة في «مصنفه» (٣٥٦٧٠)، وأبو يعلىٰ في «مسنده» (٥١٢٢).

قال الهيثمي في «المجمع» (١٠/ ١٨٩): «ورجالهما رجال الصحيح غير عمران بن داود القطان وقد وثق».
وحسنه لغيره محققو المسند. «المسند» (٦/ ٣٦٨) (٣٨١٨) ط الرسالة.

ﷺ نمونەیەکمان بۆ دێنێتـەوە لـە بـارەی مەترسـیداری تاوانە وردەکان و ئەفەرموێ: بەڕاسـتی نمونـەی تاوانـە وردەکـان وەك خەڵکانێك وایە لە نێو جەرگەی دۆڵێکدا لا بدەن، جا ئەمەکەیان بـڕوا چڵە دارێك بێنێت و ئەوەکەیان چڵێکی تر، ئا بەو شێوەیە ئەوەندە کۆ دەکەنەوە تا چێشتەکەیانی پێ لێ دەنێن، بەڕاسـتی تاوانـە وردەکـان ئەگەر کۆ ببنەوە خوای مەزن نەیسرێتەوە خاوەنەکەی لە ناو دەبات».

لە سـونەنی ئـیبن ماجەشـدا هـاتوە بـە سـەنەدێکی صـەحیح لـە فەرمودەکـەی عائیشـەوە -ڕەزای خـوای لـێبێ-، پەیامبـەری خـوا ﷺ فەرمویەتی: «إِيَّاكِ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوب فَإِنَّ لَهَا مِنْ الله طَالِبًا»[1]. «ئامان ئەی عائیشە! وریای تاوانە وردەکـان ببـە، چـونکە بێگومان لە لایەن خوای مەزنەوە داواکـارێکی هەیـە». یـانی: جـۆرە سزایەکی بۆ دانراوە بە دواوەیەتی و هەر تۆڵەی لـێ دەکاتـەوە، هـەر بۆیە نابێت هەرگیز بێ ئاگا بین لە تاوانەکان گەورە بن گچکە.

**برا خۆشەویستەکەم.. خوشکە بەڕێزەکەم**

دەزانیت ئەو تاوانە ورد و بچوکانەی وا من و تۆ بە هیچی نازانین، ئەگەر:

---

(١) أخرجه ابن ماجه في «سننه» (٤٢٤٣)، والدارمي في «مسنده» (٢٧٦٨)، وأحمد في «مسنده» (٢٥٠٥٣، ٢٥٨١٦)، وابن أبي شيبة في «مصنفه» (٣٥٤٧٨)، والنسائي في «الكبرىٰ» (١١٨١١).

قال الألباني في «الصحيحة» (٢/ ٤٠) (٥١٣) «وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال البخاري غير ابن بانك... وهو ثقة». وقال محققو المسند: «إسناده قوي» (٤٠/ ٤٧٨) (٢٤٤١٥) ط الرسالة.

١. بەکەم تەماشا بکرێت.

٢. گوێیان پیێ نەدرێت.

٣. لە خوا نەترسێت لە ئەنجامدانی.

**ئەوا: سەر دەکێشێت بۆ تاوانە گەورەکان.**

ئەمەش لەو وتەیەی ئیبن عەبباس و ئەنەسەوە ڕەزای خوایان لێبێت وارگیراوە کە سابت بووە لێیانەوە، ئەفەرمون: «لاَ صَغِيرَةَ مَعَ الإِصْرَارِ، وَلاَ كَبِيرَةَ مَعَ الاِسْتِغْفَارِ»[1]، «تاوانێك بچوکیش بێت مادام سور بیت لەسەری بە بچوك هەژمار ناکرێت». یانی هەر تاوانێك:

مرۆڤ سور بێت لەسەری و بە بەردەوامی ئەنجامی بدات.

بە سوك و کەم تەماشای بکات.

بە کردنی دڵخۆش بێت و شانازی پێوە بکات.

ئەوا با چاك بزانێت ئەو تاوانە بچوك نیە و گەورەیە و مەترسی سزادانی لێ دەکرێت لەلایەن خوای مەزنەوە مەگەر تەوبە بکات وڕێگای کامەرانی بگرێتە بەر.

---

(١) أخرجه البيهقي في «شعب الإيمان» (٦٨٨٢)، واللالكائي في «الاعتقاد» (٦/ ١١١٠) (١٩١٩). ورجاله ثقات، لكنه منقطع.
وانظر: «المغني عن حمل الأسفار» (ص١٣٥٣)، و«الضعيفة» (٤٨١٠)، و«المقاصد الحسنة» (ص: ٧٢٥) (١٣٠٨).

دوای ئەوەش:

**خوشکە بە شەرمەکەم.. برا بە ویقارەکەم:**

لە بچوکی و گەورەیی تاوانەکەت مەڕوانە، لە گەورەیی ئەو خوا مەزنە بڕوانە کە بە پێش چاویەوە سەرپێچی دەکەیت.

ئەم چەند وشەیەش -بە ئیزنی خوا- ئەوانە سودی لێ دەبینن کە هەست بە تاوان باری و کەمتەرخەمی دەکەن، ئەوانەی کە چۆن بڕوایان بە: ﴿نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ [الحجر:٤٩][1] هەیە، ئاوهاش بڕوایان بە: ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ﴾ [الحجر:٥٠][2]، هەیە، کەوابوو: چار چیە، ڕێگای ڕزگاربوون لە کوێیە؟!

(١) واتە: «بە بەندەکانم ڕا بگەیەنە ئەی پەیامبەری خوا کە من لێ خوشبووم لە تاوانی بەندەکانم، وبە بەزییم لەگەڵیاندا».

(٢) واتە: «وپێشیان ڕا بگەیەنە کە سزام زۆر بە ئازارە، سا با بگەڕێنەوە بۆ لام، تا لێیان خۆش ببم لە سزام دڵنیا بن».

# ڕێگای ڕزگار بوون لە کوێیە؟

**لەوانەیە بڵێی:**

من کامەرانیم دەوێ، ئەمەوێ ڕزگاربم، هیوام لێ خۆشبوونە، بەڵام نازانم چۆن؟! نازانم چۆن دەست پێ بکەم؟

من وەك خنکاوێکم، خوا خوایەتی یەکێك دەستی بگرێت، وەك سەر گەردانێکم سەری لێشواو بێت، ڕێگەی لێ ون بوو بێت، چاوەڕێی یارمەتیە، تروسکەیەك هیوام دەوێت، تیشکێك ڕوناکیم دەوێت، بەڵام ڕێگاکە لە کوێیە، ڕێگاکە...؟!

ڕێگاکە، دیارە وەکو خۆر، ڕۆشن ودرەوشاوە وەکو مانگ، یەکێکە و دوانی بۆ نیە...

ئەویش ڕێگەی تەوبە کردنە، ڕێگای پەشیمان بوونەوەیە، ڕێگای گەڕانەوەیە بەرەو لای خوا... ڕێگەی ڕزگاربوون، ڕێگەی سەرفرازی.

ڕێگەیەکی ئاسانە، لەهەموو ساتێکدا بەرامبەرت والآیە و کراوەیە، ئەوەندەت لەسەرە تەنها: ئەو ڕێگایە بگریتە بەر و لە دەرگاکە بدەیت، ڕاستەوخۆ گوێت لە وەڵامەکە دەبێت و ئەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾﴾ [طـه:٨٢]. «بەڕاستی من لێ بوردەم لە ئاست ئەو کەسەی پەشیمان دەبێتەوە و تەوبە دەکات و باوەڕ دێنێت و کردەوەی چاك ئەنجام دەدات، پاشانیش ڕێگای ڕاست

دەگرێتە بەر، شوێن پێی پەیامبەرەکەم هەڵدەگرێت و بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ئیسلامەتیە هەتا مردن».

ئەوەتا خوای پەروەردگار سبحانە وتعالی بانگی سەرجەم بەندەکانی خۆی دەکات، باوەڕدار و بێ باوەڕ، کە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای، لەسەرجەم تاوانەکان: لە بێ باوەڕی، لە هاو بەش دانەران، لە دوو ڕوویی، لە داهێنان لە دیندا، لە خراپەکاری وتاوان وسەرپێچی...

پێی ڕایگەیاندوین کە ئەو لەسەرجەم تاوانەکان خۆش دەبێت، هەر تاوانێك بێت! چەند زۆریش بێت! چەند گەورەش بێت! با وەك کێوەکان بێت لە گەورەییدا، با وەك کەفی دەریا بێت لە زۆریدا، هەر لێی خۆش دەبێت، هەر وەك خۆی دەفەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾[الزمر:٥٣]. «ئەی موحەممەد! بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی ئەو بەندانەم! کە تاوان و هەڵەی زۆرتان ئەنجام داوە، زیادەڕۆیتان کردوە لە هەرچی جۆری تاوان هەیە، توشی نائومێدی مەبن لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا و بڵێن: تاوانەکانمان زۆرە و عەیب و عارمان زۆرە، تازە چی ئەیسڕێتەوە؟! ئیتر بەو بیانوەوە بڕۆن بەردەوام بن لە تاوان کردن و سەرپێچی کردن، ئەوسا دەرەنجام خوا لە خۆتان تورە دەکەن، نەخێر هەرگیز نائومێد مەبن، بەڵکو پەروەردگارتان بناسن، ئەو زۆر لێ خۆشبوە، زۆر لێ بوردەیە، زۆر نیانە، تۆبەکاری زۆر خۆش دەوێت، **نوزەی گریانی**

**تۆبەکاری لە تەسبیحاتی عابدانی لا خۆشترە**، بزانن کەوا ئەو: لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت: لە شیرك، پیاو کوشتن، زیناکردن، سوو خواردن، عارەق خواردن، ستەم کردن، حەرام خواردن و حەرام کردن.. لە هەرچی تاوان و هەڵەی گەورە و بچوکی تر هەیە لە هەمووی خۆش دەوێت، بێگومان ئەو خوایە زۆر لێبوردە و بە سۆز و میهرەبانە، غەفور و ڕەحیمە، دوو سیفەتن هەرگیز لە خوای مەزن جیا نابنەوە، بە شەو و ڕۆژ دەستی والا کردوە بۆ تاوان باران، بەڵام بۆ لیێ خۆشبون و میهرەبانی خۆی، هۆکاری دانـاوە، گەورەترین هۆکارێکیش مرۆڤ بیگرێتە بەر، بەڵکو هیچ هۆکارێکی دی نیە جگە لە ئەوە نەبێت، بریتیە لە: گەڕانەوە بۆ لای خوای مەزن، ئەویش بە تەوبەی پاك و ڕاستەقینە، بە نزا و پاڕانەوە و عیبادەت کردن، جا وەرن و دەست بگرن بەم هوکارە مەزنەوە، بەم ڕێگا فراوانە ڕوونەوە تا سەرفراز ببن».

۞ ۞ ۞

## ئەی تەوبە کردن چیە؟

تەوبە کردن لە زمانی عەرەبیدا لە بنەڕەتدا: بە مانای هەریەك لە: گەڕانەوە، و هاتنەوە، و پەشیمان بوونەوە دێت.

**بەڵام شەرعدا زانایان چەندین پێناسەیان کردوە لەوانە:**

**١.** «الاسْتِغْفَارُ بِاللِّسَان، والإقْلاعُ بالأَبْدان، وإِضْمَارُ تَرْكِ العَوْدِ بالجَنَان، ومُهَاجَرةُ سَيِّءِ الإِخْوَان، وإِرجَاعُ حُقُوقِ بَنِي الانْسَان». «بریتیە لە داوای لێخۆشبون کردن بە دەم، و پەشیمان بوونەوە و دەست بەردار بوون بە لاشە، و سور بوون و جەخت کردنەوە لە دڵەوە لەوەی نەگەڕێیتەوە، و دوور کەوتنەوە لە برادەری خراپ، و گەڕانەوەی مافی خەڵك -ئەگەر بە لاتەوە هەبوو-».

**٢.** «تَرْكُ الذنبِ عِلْمًا بقُبحِه، ونَدَمًا عَلىٰ فِعْله، وعَزْمًا عَلَىٰ أَلّا يَعُودَ إِلَيْهِ إِذَا قدر، وردُّ المظْلَمَةِ إِنْ كَانَت، أَوْ طَلَب البَرَاءَة مِنْ صَاحِبِها؛ إِخْلاَصًا لله، ورَجَاءً لِثَوَابِه، وخَوْفًا مِنْ عِقَابِه، وأَنْ يَكُونَ ذلِكَ قَبْلَ الغَرْغَرَةِ، وقَبْلَ طُلُوع الشَّمْس مِنْ مَغْرِبها». «وازهێنان لە تاوان لە بەر خراپیەکەی، و پەشیمان بونەوە لە کردنەکەی، و سور بوون لەسەر نەگەڕانەوە، و گێڕانەوەی ئەوەی بە ستەم لایەتی یان گەردن ئازایی کردن لە خاوەنەکەی؛ هەموو ئەمانەش تەنها لەبەر خوا و بە هیوای پاداشتی و ترسان لە سزای بێت، ئەبێت ئەمەش پێش سەرە مەرگ و پێش هەڵاتنی خۆر بێت لە خۆر ئاواوە».

٣. «هِـي الرُّجُـوعُ مِمَّـا يَكْرَهُـهُ اللهُ ظَـاهِرًا وبَاطِنًـا إِلَـىٰ مَـا يُحِبّـه ظَـاهِرًا وبَاطِنًا». «بریتیه له پەشیمان بوونــەوه و گەڕانــەوه لــەوەی خــوا پێــی ناخۆشه به ئاشکرای و شاراوەیەوه بــۆ ئــەوەی خــوا پێــی خۆشــه بــه ئاشکرای و شاراوەیەوه».

ئەمەشیان پێناسەیەکی گشت گیرە و سەرجەم یاساکانی ئیســلام و هەقیقەتەکانی ئیمان دەگرێته خۆی.

بەڵێ، تەوبه کردن ڕێگایــەکی پــارێزراوه لــه بــێ ئومێــدی و بــێ هیوایی، کانی پڕ ئاوه بۆ هەموو شــەکەتێکی ئــاوی ســازگار نــەدی، سەرچــاوەی خێــره بــۆ هــەموو خێــر و خۆشــیەکی دونیــا و دوا ڕۆژی ئەبەدی، تەوبه کردن ســەر هــەموو شــتێکه، ژیانەوەیــه، هــۆی ســەر فرازیه، مــاڵی یەکــەم و ناوەڕاســت و کۆتــای مرۆڤــه، تەوبــه کــردن سەرەتای بەنده و کۆتاییەتی.

بەڵێ، **تەوبەکردن:** وازهێنانه له تاوان تەنها له ترسی الله، هەســت کردنه به ناقۆڵایی و ناشیرینی تاوان، پەشــیمان بوونەوەیــه لــه تــاوان کردن، و سوور بوونــه لەســەر نەگەڕانــەوه بــۆ تــاوان ئەگــەریش بــۆی بڕەخسێت و تواناشی هەبێت، تەوبه کردن هەست کردنه به پەشیمانی له ئاست ئەو هەڵه و تاوان و خراپی و سەرپێچــیانەی کــه ڕویانــداوه، ڕوو کردنه خوایه لەو تەمەنەی که ماوه.

## بۆچی تەوبە بکەین؟

**برای سەنگینم... خوشکی بە شەرمم!**

پێ دەچێت لێم بپرسی: بۆ دەبێت واز لە جگەرە کێشان بهێنم لە کاتێکدا پێی مورتاح دەبم؟

بۆ واز لە تەماشاکردنی فیلمی خراپ بهێنم لە کاتێکدا چێژی لێ وەر دەگرم؟

بۆ واز لە ڕا بواردنی تەلەفۆنی بهێنم لە کاتێکدا ئەوە ئاواتی منە؟

بۆ دەست بەرداری تەماشا کردنی ئافرەت ببم لە کاتێکدا پێی ئاسودە دەبم؟

بۆ دەبێت پەیوەست بم بە نوێژ و ڕۆژووەوە لەکاتێکدا من حەزم بە خۆ پەیوەست کردن و بەستنەوە نیە؟

بۆچی و بۆچی...؟!

ئایا پێویست نیە مرۆڤ ئەوە بکات کە خۆشحاڵ و ئاسودەی دەکات و خۆشی خۆی تێدا دەبینێتەوە؟ دەی ئەوەی کە من ئاسودە دەکات ئەوەیە وا تۆ پێی ئەڵێی تاوان...

کەوابو بۆ تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە، بۆ لە خۆشیەوە خۆم بخەمە ناخۆشی؟!

جا پێش ئــەوەی وەڵامــی پرســیارەکە بدەمــەوە بــاش بزانــە -**بــرا سەنگینەکەم.. خوشکە بــە شــەرمەکەم**- خــواش ئــەزانێت کــە تــەنها ئاسودەیی تۆم دەوێ و هیچ مەبەستێکم نیە جگە لە ســەر فــرازی تــۆ نەبێت، هیچ مەبەستێکم نیە تەنها خێر و خۆشــی و ســەرکەوتنی تــۆ نەبێت لە هەر دوو دونیادا، هەر بۆیە دڵنیابە گەر بزانم بــە هەقیقــەت ئەو شتانە مرۆڤ ئاسودە و خۆشحاڵ دەکەن، هــەرگیز قەڵــەمم لەســەر کاغەز نەدەنا و ئەم چەند دێڕەم بۆت نەدەنوسی!!

ئێستاش دێمە سەر وەڵامی پرسیارەکەت:

**تەوبە بکە برام.. خوشکم**، چونکە تەوبە کردن:

## یەکەم: تەوبە کردن گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری پاك و میهرەبانتە

ئەوە پەروەردگاری مەزنە فەرمان بە من، بە تۆ، بە ئەو، دەکــات، فــەرمان بــە هــەموومان دەکــات، هــەموو.. کــەوا تەوبــە بکــەین و بگەڕێینەوە و پەشیمان ببینەوە، هــەروەك دەفــەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا﴾ [التحريم:٨]. ((ئەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە تەوبەیەکی نەصــوحەوە، بــە گەڕانەوەیەکی پاك و پوختەوە)).

هەروەها لــە ئايــەتێكی شــيرينی تــردا دەفــەرموێت: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ [النور:٣١]، «ئــەی ئيمانــداران! هەمووتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و تەوبە بكــەن بــەڵكو ســەركەوتو و سەرفراز بن».

دەبينی ئايەتەكە دەفەرموێ: ئەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە بــە ئيمانداران بانگ دەكات.

كەواتە **تەوبە كردن تايبەت نيە بە تاوانبارانەوە**، هەر لەســەر ئــەو نيە بە تەنها تەوبە بكات، بەڵكو تۆی ساڵحانيش، تۆی پياو چاكيش، تۆی مولتەزميش، تۆی ڕێكوپێكيش... وا مەزانە ئەم كتێبــە باســی تۆ ناكات و پەيوەندی بە تۆوە نيــە...، نــەخێر، بــەڵكو تەوبــە كــردن واجبە لەسەر ئيماندار و پياو چاك و تاوان بــار و فاســق و سەرپێچــی كار... واجبە لەسەر هــەموو ئەوانــەی كــە بــانگی: ﴿ئــەی ئەوانــەی ئيمانتان هێناوە﴾ دەيانگرێتەوە.

جا فەرمانی خواش دەبێت گوێڕايەڵی بكرێت و بە دەميەوە بڕۆی.

## دووەم: هۆكارێكە بۆ شادمانی و سەرفرازيت لە دونيا و دوارِۆژدا

خوای پايە بــەرز دەفــەرموێ: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ [النور:٣١]. «هەمــووتان بگەڕێنەوە بــۆلای خــوا و تەوبــە بكەن ئەی ئيمانداران بەڵكو ڕزگارتان بێت و سەر فراز بن».

یانی: ئەگەر سەر فرازی دونیا و دوا ڕۆژتان دەوێت، تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای میهرەبان.

ئیبن کەسیریش دەڵێت: «یانی: ئەو شتانە بکەن کە من فەرمانتان پێ دەکەم لە ئاکار و ڕەفتار و گوفتار و ڕەوشتە جوان و بەرزەکان، هەروەها وازیش لەو ئاکار و ڕەفتار و گوفتار و ڕەوشتە چەپەڵانە بهێنن، چونکە بێگومان سەر فرازی هەقیقی بریتیە لە بە جێ گەیاندنی فەرمانەکانی خوا و پەیامبەرەکەی و وازهێنان لەوەی ئەوان نەهیان لێ کردوە.

شێخ ئەحمەد بن عەبدولحەلیمیش -بە ڕەحمەت بێت- ئەڵێت: «دڵ هەرگیز چاکی و شادمانی و سەرفرازی و چێژ وەرگرتن و خۆشحاڵی و ئۆقرەیی و ئارامی بە خۆوە نابینێت، **مەگەر بە عیبادەت کردنی پەروەردگارەکەیی و خۆشویستنی و گەڕانەوە بۆ لای ئەو نەبێت**، بە ئەوە دڵی ئارام دەبێت».

پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ۝٢٨﴾ [الرعد:٢٨]، «باش بزانن، دڵنیا بن هەر بە یادی خوا دڵەکان دەحەوێتەوە و ئارام دەبێتەوە».

هەروەها خوای لێ خۆشبو و نیان دەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ

فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ [الأنعام:١٢٥]، ((جا ئەو کەسەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات و ڕێی نیشان بدات، ئەوە سینگی فراوان دەکات و دەیگەشێنێتەوە بۆ ئایینی ئیسلام، ئەوەشی خوا بیەوێت گومڕای بکات -بە هۆی نەشیاوی خۆیەوە-، دڵی زۆر تەنگ و تەسك دەکات، وەك ئەوەی بیەوێت بەرەو ئاسمان بەرز ببێتەوە، ئا بەو شێوە خوا پیسی و ناپاکی لەسەر دڵی ئەوانە دادەنێت کە باوەڕ ناهێنێنن.

کەواتە ئیمان هێنان و هیدایەت وەرگرتن، حەوانەوەی دڵە، هەر وەك چۆن گومڕایی و لە ڕێ لادان، تەنگی و تەسکی دڵە.

دە کەوابو ئەوەی تۆ پێی دەڵێی دڵنیایی، دڵشادیی، سەرفرازی، خۆشی...، لە هەقیقەتدا شایستەی ئەو وەسفانە نین!! ئەگەریش چێژێکی تێدا بێت:

**یان** بە هۆی ئەوەیە کە زۆر بەردەام بوویت لەسەر کردنی ئەو کارە، **چێژەکە لە خو پێوە گرتنەکەیە نەك لە خودی شتەکە**، وەکو کەسێك جگەرە بکێشێت، ئایا جگەرە کێشان چێژی تێدایە بۆ کەسێك یەکەم جار و دووەم جاری بێت؟! هەروەها ئەوەشی تلیاك دەکێشێت؟! بەڵام لەوەو دوا چێژیشی لێ وەربگرێ لەبەر خۆشی تلیاکەکە نیە، لەبەر خو پێوەگرتنێتی -موعتاد بوونە لەسەری-.

**یان** ئەگەر چێژێکیشی تێدا بێت، **ئەوە کاتیە**، تەماشاکردنی فیلمی ڕووت، چێژی تێدایە یان تاڵی؟ چەند خولەکێك دوای تاوانەکە و هەر تاوانێکی تر وەڵامی پرسیارەکەت بۆ دەرکەوتوە.

بە مۆبایل ڕابواردن لەگەڵ کچاندا خۆشی تێدایە؟! ئەی کە تەلەفۆنەکە دادەخەیت؟! سوێند بە خوا ئەگەر هەر کەسێکی ژیر تەنها لە غەم و پەژارە و خەفەتەکەی دوای تەلەفۆنەکە ورد بێتەوە بەسە بۆ ئەوەی واز لەو کارە بهێنیت!

دوو دڵ نیت؟ بێتاقەت نیت؟ نارەحەت نیت؟ ڕاڕا نیت؟ ناترسی حەیات بچێت؟

ئەگەم پێی، پێی ناگەم؟! کەی بیبینم؟! کە بینیتیش غەم و خەفەت سەر دڵت دادەگرێت، کەی لە نزیکەوە بیبینم؟! کە لە نزیکیشەوە بینیت، کەی لە شوێنێکی وا بیبینم هەندێك شتی لەگەڵدا باس بکەم؟! کە ئەوەشت بۆ ڕەخسا، دەگەڕێی بۆ دۆزینەوەی فێڵێك بۆ ئەوەی شتی تری لەگەڵدا بکەی!

چونکە لە یەکەم ساتدا بە مۆبایل قسەت لەگەڵ کرد ئەمەت مەبەست بوو! ئەگەریش مەبەستت ئەمە نەبوو بێت دڵنیات دەکەم شەیتان هەر وای لێ دەکات! ئیتر ئا بەو شێوەیە پەژارە لە دوای پەژارە...

مەبەستم ئەوەیە خۆشی و تام و چێژ و حەوانەوە لە تەوبە و **خۆشویستن** و پەرستشی پەروەردگاری مەزندایە و هەرگیز خۆشی و تام و چێژ و حەوانەوە لە تاوان کردندا نیە.

## سێیەم: هۆکارێکە بۆ ئەوەی خودا خۆشی بوێت

**خوشکی بە شەرمم.. برای بە هەست و ڕەحمم!** بزانە کەوا خوای مەزن تەوبە و تەوبەکارانی خۆش دەوێت، بەڕاستی **عیبادەتی تەوبە کردن** لە خۆشەویسترین و بەڕێزترین عیبادەتەکانە لای خوای پایە بەرز، بەڵێ خوای مەزن تەوبە کارانی خۆش دەوێت، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ [البقـرة:٢٢٢]. ((بەڕاستی خوا تۆبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت)).

پێشەوا و مامۆستامان ئیبن قەییم -خوا بە ڕەحمەتی بکات و گۆڕەکەی ڕووناك بکاتەوە- ئەڵێت: «ئەگەر تەوبە کردن خۆشەویسترین شت نەبوایە لای خوای مەزن، خۆشەویسترین بەندەی خۆی تووش نەدەکرد بە تاوان کردن، جا لەبەر ئەوەی حەزی لە تەوبە کردنی بەندەکەیەتی، توشی دەکات بە تاوان کردن تا ئەوە بکات کە پێی خۆشە، کە ئەویش تەوبە کردن و گەڕانەوەیە، تا زیاتر خۆشی بوێت، بەڕاستی پەروەردگاری بە بەزەیی خۆشەویستیەکی تایبەتی هەیە بۆ تۆبە کاران...».

# چوارەم: هۆکارێکە بۆ ڕۆیشتنە بەهەشت و ڕزگاربوون لە ئاگری پڕ ئێشی دۆزەخ

خـــودای پایەبـــەرز دەفـــەرموێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾﴾ [مريم:٥٩-٦٠]، «لـــە دوای تێپـــەڕبونی ســـەردەمی ئـــەو پەیامبەرانە و شوێنکەوتوەکانیان، سەردەمانێکی تر و خەڵکانێکی تر هاتن بە دوای ئەوانـدا کـە **نوێـژەکانیان فەوتانـد** و شـوێنی هـەوا و ئارەزوەکانی خۆیان کەوتن، ئەوانە توشی سـزایەکی زۆر تونـد دەبـن. **جگە لە ئەوانەیان نەبێت کە تەوبەیان کرد** و ئیمانیان هێنـا و کـار و کردەوەی چاکیان ئەنجامدا، گەڕانەوە بـۆ نوێـژکردن و پارێزگـاری لـێ کردنی و شوێن کەوتنی فەرمایشتی خوا و پەیامبەرەکەیان، ئا ئەوانە خوای لێ خۆشبو تەوبەیان لێ وەر دەگرێت و ئاخر خێریـان دەکـات و دەیانکاتە میرات گری بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت».

**خوشـکی دڵســۆزم... بـرای ئـەزیزم! پـێم بڵـێ:** توخـوا هـــیچ خواستراوێکی تر هەیە، هیچ ئاواتێکی تر هەیە، هیچ ئامـانجێکی تـر هەیە، هیچ مەبەستێکی تر هەیە؛ شایستەتر بێـت لـە بەهەشـت تـا مرۆڤ لە بری ئەوە هەوڵی بۆ بدات؟!

دڵنیام دەڵێی: نەخێر... بەڵام ئەوەندە هەیە پێ ئەچێت بڵێی: ئـەو بەهەشتە نا کە تۆ مەبەستتە!

نا... ئەو بەهەشتەی کە خۆم مەبەستمە.

**دەزانــی!** هەرچی مرۆڤ لەم دونیایەدا هەیە بە کردەیی کۆك و یــەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە هەرچی مرۆڤ هەیە و ئەوەشی بووە و ئەوەشی دەبێت: هەر هەمووی مەبەستی دەستەبەر کردنی کامــەرانی و خــۆش گوزەرانی و ئاسودەیی و سەر فرازی خۆیەتی، لە هەمان کاتدا لادانــی هەرچی تەنگ و چەڵەمەیی و ناڕحەتی و مەینەتیە لەسەر خۆی؟!

بەڵام لەوانەیە تێگەیشتنەکان بۆ مانا و مەبەست لە: کامــەرانی و خۆش گوزەرانی و ئاسودەیی و سەر فرازی، جیاواز بێت.

لەوانەیە کامەرانی لای ئەو:

بە ناهەق خواردنی ماڵی خەڵك بگەیەنێت! ماڵی خەڵك کاول کردن بگەیەنێت! هەیە پێی مورتاح دەبێت!؟

چەوساندنەوەی هەژاران و خەڵکی ڕەش و ڕوت بگەیــەنێت! هەیــە کەیفی پیِ دێت!؟

پلە وپایە و کورسی گرتنە دەست و بوون بە دەم سـپی بگەیــەنێت! ئەمە ئاواتی ئەمەیە. هەیە ئــەو کورســیە وەکــو ئــەو چێشــتەی تــۆ دەیخۆی ئاوها چێژی لیِ دەبینێت! هەر بۆیە گەلێك جار کوێری دەکات و غەیرە کورسیەکەی نابینێت و ئامادەیە هەر شتێك بکات لە پێنــاو مانەوەیدا !؟

ڕا بواردن بگەیەنێت! مەی خواردنەوە بگەیەنێت! داوێن پیسی و پڕ کردنەوەی ئارەزوی ڕەگەزی (سێکسی) بگەیەنێت! ئیتر هەر چۆنێك بێت! کێ بێت! لە کوێ بێت! هەیە تاکە خەمی ئەمەیە.

دژایەتی کردنی ئایینی ئیسلام بگەیەنێت! قسە کردن بە خوا سبحانە وتعالی قسە کردن بە پەیامبەران و پیاو چاکان و زانایان و سالّیحان و شوێن دین کەوتوان بگەیەنێت! کە ئەمانەش گەلێك جار لە خودی خۆیدا مەبەست نین... بەڵکو هۆکارن و بە هۆیانەوە و لەژێر ئەمەدا، شتی تر بە دەست دێن، یانی: دژایەتی ئیسلام و ڕەمزەکانی ناکات لەبەر ئەوەی ئیسلام بە خراپ دەزانێت... نا... بەڵکو لەبەر ئەوەی بەم دژایەتی کردنە شتی تری دەست دەکەوێت و لەڕێیەوە کۆمەڵێك لە حەزەکانی جێ بە جێ دەکات.

**لە بەرانبەر ئەوانەدا! هەشە بە پێچەوانەوە دەڕوانێتە واتای کامەرانی**، پێی وایە کامەرانی و خۆش گوزەرانی و ئاسودەیی و سەر فرازی مرۆڤ لە پێچەوانەی ئەوانەدایە، لە جوان بە جێگەیاندنی فەرمانەکانی خوای دانا و پەیامبەرە بە ڕەحمەکەیدایە.

لە ئەمەوە بۆمان دەر دەکەوێت کەوا حەزی مرۆڤەکان زۆرن.. بەڵام هەر هەموو یەك دەنگن کە هەرچی دەکەن سەرفرازی بۆ خودی خۆیان تێدایە، یان هۆکارە بۆ گەیشتن بە: سەرفرازی...

لـه كۆتـايى ودەر ئـەنجاميش زيـاتر دەر دەكـەوێت سـەر فـرازى تەواوەتى تەنها لە نزيكيە لە خواوە تبارك وتەعالى.

نابينى؟

گۆرانبێژەكان دێنەوە بۆ لاى خـوا وئـەڵێن ئاسـودەييمان ئـەوێت. ديارە ئاسودەيى لە ڕێگاكەى خۆيدا نەبينيەتـەوە! ئەگـەرنا بـۆ جێـى دەهێڵێت ودەگەڕێت بە دواى ئازاديدا؟!

ئەكتەر وهونەرمەندەكان[1] تەوبـە دەكـەن وئـەڵێن: كامـەرانيمان دەوێت!

پاڵەوانەكانى تۆپى پێى وبۆكسێن وكۆنفۆ وهتد پەشـيمان دەبنـەوە لە ڕێچـكەكەى پێشـووى خۆيـان وڕوو دەكەنـە خـوا وئـەڵێن: خـۆش گوزەرانيمان دەوێت.

جا خواى مەزن پێمان دەڵێت: ئەوە بكەن كە من پێتان دەڵـێم: لـە دونيادا سەرفراز دەبن، پاشـان لـە ئاخيرەتيشـدا: كامـەرانى و خـۆش گوزەرانى و ئاسودەيى و سەر فرازى ڕاستەقينەتان بۆ هەيە، كە بريتيە لە بەهەشت.

هەرگيز سەرفرازى لەوەدا نيە كە پێچەوانەى شەريعەتەكەى منـە، سەر فرازى تەنها لە ئەوەدايە كە من فەرمانم پێ كردوە.

---

(١) ئەوانەى پێيان دەوترێت: ئەستێرە، لە ڕاستيدا ئەو وەسفە ستەمە بۆ زۆربەيان.

کەواتە ئەی ئەو کەسەی کە سنورەکانی خوای بالاّ دەست دەشکێنیت، لەبەر خاتری ئەوەی سەر فراز ببیت و ئاسودەیی خۆتی تێدا ببینیەوە؛ پێش بکەوە و پەشیمان ببەوە و تەوبە بکە، دلّنیا بە ئاسودەیی هەقیقی لە بە جیّ گەیاندنی فەرمانەکانی خوای کار ساز و پەیامبەری دلّسۆزدایە، پاشانیش لەوەو دوا مەزنترین بردنەوە و سەر فرازیت بۆ هەیە کە بەهەشت وبینینی خوایە.

## پێنجەم: هۆکارێکە بۆ خوش گوزەرانی و چاك بونی باری ژیان و دابارینی باران و زیاتر بە هێز و قوەت بوون و زۆربوونی ماڵ ومنداڵ

خوای مەزن ئەفەرمویّ: ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَيُؤۡتِ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥۖ وَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ كَبِيرٍ ٣﴾ [هود:٣].

«هەروەها داوای لیّ خۆشبون لە پەروەردگارتان بکەن و پەشیمان ببنەوە لە خراپە و تەوبە بکەن، کە ئەوەتان کرد: دلّنیا بن خۆشگوزەرانتان دەکات تا ماوەیەکی دیاری کراو، و لە فەزلّ و بەخششی خۆی بەشی هەرچی خاوەن فەزلّ و بەخششە دەدات، خۆ ئەگەریش پشت هەلّ بکەن، ئەوا بەڕاستی ترسی ئەوەم لێتان هەیە سزایەکی توند یەخەتان پیّ بگرێت».

هەروەها خوای نیان و میهرەبان لەسەر زوبانی هودەوە عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ دەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ

ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾ [هــــود:٥٢]،

«ئەی قەومەکەم! داوای لێ خۆشبوون لە پەروەردگارەکەتان بکەن و پاشان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای، کە ئەوەتان کرد:

- بارانی بەلێزمە و پڕ خێرتان بۆ دەبارێنێت.

- بازوتان بەهێز دەکات، هێز و دەسەڵاتتان پێ دەبەخشێت زیاتر لە ئەو هێز و دەسەڵاتەی هەتانە.

هەروەها لەسەر زوبانی نوحەوە عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ بۆمان باس دەکات کە بە گەلەکەی خۆی فەرموەوە: ﴿فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ﴿١١﴾ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا ﴿١٢﴾﴾ [نوح:١٠-١٢]. «پێیانم ڕاگەیاند کە داوای لێ خۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، بەڕاستی ئەو خوایەکی زۆر لێ خۆشبووە، کە ئەوەشتان کرد:

- بارانی بە لێزمە و ڕەحمەتتان بۆ دەبارێنێت

- ماڵ و سامانتان پێ دەبەخشێت.

- منداڵتان پێ کەرەم دەکات.

- باخ و باخاتتان پێ دەخشێت، زەویتان بۆ سەوز دەکات.

- ڕووبارتان بۆ بەدی دێنێت.

بەڵێ خۆشەویستان... بەڕاستی تەوبە کردن شتی زۆر سەیر و سەمەرە بۆ تەوبە کارەکە بەدی دەهێنێت، پلە و پایە و مەقامی وای بۆ بەدی دەهێنێت کە بە بێ تەوبە کردن بەدی نایەت، وەکو: خۆشویستنی خوا، دڵ نەرمی و نەرم و نیانی، شوکرانە بژێری، ستایشی خوا کردن، لە خوا ڕازی بوون... هەورها باران بارین، بەخشینی ماڵ و سامان، پێ کەرەم کردنی وەچە و منداڵ، باخ و باخات، هەڵقوڵانی ڕووبارەکان. جا ئەوەندە ناز و نیعمەتی بە دواوەیە، کە هەمیشە لە دوای تەوبە کردنەکەی لە نێو بەرەکەت و ئاسەوارە شیرینەکانیدا دەحەوێتەوە، خوای مەزن من و ئێوەشی لێ بێ بەش نەکات.

سەیریشت لێ نەیەت، ئەوە خوای مەزنە هەرچی ویستی لێ بێت بە حیکمەت ودانایی و کار جوانی وکار سازی خۆی ئەنجامی دەدات.

## شەشەم: هۆکارێکە بۆ سڕینەوەی تاوانەکان، بەڵکو گۆڕینی بۆ خێر و چاکە

جا تەبە کردن تاوانەکان دەسڕێتەوە، نەك هەر سڕینەوە بە تەنها بەڵکو دەشیگۆڕێت بە خێر و حەسەنات، خوای پایە بەرز دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ [التحريم:٨]، «ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەکی پاك و

پوختەوە، بەشکو پەروەردگارتان بە هۆیەوە لـە گوناهــەکانتان خـۆش ببێ و بیسڕێتەوە و بتان خاتـە نـاو بەهەشـتانێکەوە کـە ڕووبـار بـە ژێریانـــدا دەڕوات». کەواتـــە ئـــەوەی ئەیـــەوێت خـــوای بەخشـــندە گوناهەکانی بسڕێتەوە با تەوبە بکات.

هـــەروەها ئەفـــەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ﴾ [طـه:٢] «بەڕاستی من لێ بوردەم لە ئاست ئـەو کەسـەی کـە تەوبـە بکـات و باوەڕ بهێنێت و کـردەوەی چـاك ئـەنجام بـدات و پاشـان شـوێن پێـی پەیامبەری خوا هەڵ بگرێت و بەردەوام ببێت تا مردن، ئەوا سـەرجەم تاوانەکانی بۆ دەسڕمەوە».

سا ئەی ئەوەی ئەتەوێ خوا لە گوناهەکانت خۆش ببێت تەوبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای خوای مەزن.

هەورەها خوای بە بەزەیی وبەخشـــندە دەفـــەرموێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ [الزمر:٥٣]. «ئەی موحەممەد! بڵێ: خوا دەفەرموێ: ئەی ئەو بەندانەم! کـە تاوان و هەڵەی زۆرتان ئەنجام داوە، توشی نائومێدی مەبن لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا و بڵێن: تاوانەکانمان زۆرە، نەخێر... هەرگیز نائومێـد و بێ هیوا مەبن، چونکە پەروەردگارتان زۆر لێ خۆشبوو و لێ بـوردە و نیانە، بزانن کەوا ئەو: لە هـەموو تاوانێـك خـۆش دەبێـت، هەرچـی

تاوانی گەورە و بچوك هەیە لە هەمووی خۆش دەبێت، بێگومان ئەو خودایە بەخشندە وبە بەزیە».

هەروەها پەروەردگاری پاك وبەرز دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ [الفرقان:٧٠]. دوای ئەوەی خوای مەزن باسی سیفاتی «عباد الرحمن- بەندەکانی خۆی» دەکات، کە لە سیفاتیان ئەوەیە: هاوبەش بۆ خوا دانانێن، کەس بە ناهەق ناکوژن، زینا ناکەن... پاشانیش هەڕەشەی توند لەوانە دەکات کە ئەو کارانە ئەنجام دەدەن، پاشان ئەفەرموێت: ئەوانە نەبێت کە پەشیمان دەبنەوە و تەوبە دەکەن و ئیمان دەهێنن و کار و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، **ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە**، خواش هەمیشە لێ خۆشبو و میهرەبانە.

الله أكبر... تەماشای ڕەحمەت فراوانی پەروەردگار بکەن:

نەك هەر لێت خۆش دەبێت!

نەك هەر دەیسڕێتەوە!

نەك هەر قەڵەم بە خراپەکانتدا دەهێنێت!

نا... بەڵکو دەشی گۆڕێت بە چاکە و پلە بەرزی...!

فَسُبْحَانَك ربَّنا! ما أَعْظَمَك.. سُبْحَانَك رَبَّنا! ما أَكْرَمَك.. سُبْحَانَك ما أَحْلَمَك.. سُبْحَانَك ما أَرْأفَك.. فَسُبحَانك مَا عَظمْناك حَقَّ تَعْظِيمك.. سُبْحَانَك ما قَدرْناك حَقَّ قَدرك.. سُبْحَانَك ما شَكَرناك حَقَّ شُكْرك.. سُبْحَانَك وبِحَمْدك ما عَبَدْناك حَّق عِبَادَتك.. نُقِرُّ بِذُنوُبِنا وَإِحْسَانِك لَنا وَعَفْوِكَ عَنَّا.. فَلَك الحَمْدُ عَلىٰ حِلْمِك بَعْد عِلْمِك وعَلىٰ عَفْوِك بَعْد قُدْرَتِك.. ولَكِنَّا نَسْأَلُكَ أَنْ تُعَامِلْنَا بِعَفْوِك، وأَنْ تَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وتَقْصِيرَنا، فَإِنَّك تُحِبّ العَفْو وَالمَغْفِرَة، وَأَنْتَ عَفُوٌّ غَفُور.

ئەمانە هەندێك بوون لە فەزڵەكانی تەوبە كردن، نهێنیە مەزنەكانی تەوبە كردن، سودە زۆرەكانی تەوبە كردن، بەرهەمەكانی تەوبە كردن، كە پاڵنەرن بۆ تەوبە كردن و پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوە.

**برای ئازیزم.. خوشكی هێژام، ئایا** هەموو ئەم فەزڵانە -و جگە لە ئەمانەش زۆرن- ئەوە ناهێنن لە پێناویاندا پەشیمان ببیتەوە و تەوبە بكەیت؟! ئەمە سەر فرازی تۆی تێدایە، بۆ ستەم لە نەفسی خۆت دەكەیت و بەردەوامی لە سەرپێچی كردن!؟ بۆ نەفست بێ بەش دەكەیت لە نزیكبونەوە لە خوا و ڕازی كردنی؟

دەیان ڕێگە كە ئەشتزانی هەڵەیە، خراپە، بەڵام ئەتوت: با تاقی بكەمەوە بزانم چۆنە...

دەی ئەم ڕێگا ڕاستەش تاقی بکەرەوە، -سوێند بەو خوا مەزنـەی کە بەڵێنی داوە هەر کەس پشتی لێ بکات ژیانی لێ تـەنگ بکـات- دڵنیا ببە کە ئەگەر بە دڵێکی پاکەوە بگەڕێیتەوە و ئەو ڕێگا ڕاسـتە بدۆزیتەوە و لەو ڕێگەیەشەوە بە تام و چێژی عیبادەت ئاشنا بـبی... هەرگیز پشتی لێ ناکەیت...

شیاوترە بۆ تۆ، دەسـت پێشـخەری بکـەی بـۆ کارێـك کـە ئـەوە فەزڵەکەیەتی.. ئەوە بەرهەمەکەیەتی!

۞ ۞ ۞

# چۆن تەوبە بکەم؟

**برای خۆشەویستم، خوشکی بەڕێزم:** وەکو بتەوێ پێم بڵێی: بەڵێ، نەفسم ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارەکەی، ئەیەوێ پەشیمان بێتەوە لە خراپییەکەی، نەفسم دڵنیا بووە لەوەی سەرفرازی لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوەکان و ئەنجامدانی کارە حەرامەکاندا نیە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نازانم چۆن توبە بکەم؟ لە کوێوە یەکەم هەنگاو بنێم!

**منیش ئەڵێم:** خوای مەزن چاکەی بۆ هەر بەندەیەکی خۆی بوێت، هۆکارەکانی بە دەست هێنانی بۆ ئاسان دەکات و یارمەتی دەدات، جا منیش باسی هەندێك لەو شتانە دەکەم کە یارمەتیت دەدەن و هاوکاریت دەکەن لە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە:

## یەکەم: ئیخلاص بوون بۆ خوا

ئیخلاص: واتە: ساغ کردنەوەی نیەت، و پاك کردنەوەی دڵ، یانی: تەنها خوا مەبەست بوون، بەڕاستی ئیخلاص بە سودترین دەرمانە نەك بۆ تەوبە کردن، بەڵکو بۆ هەرچی دەرد هەیە، تەنانەت مەرجە لە هەرچی کار و کردەوەیەك ئەنجامی دەدەی هەبێت، ئەگەرنا لێت وەر ناگیرێت، هەر لە وتنی «لَا إِلَه إِلَّا الله» وە، هەتا لابردنی ئازارێك لەسەر

ڕێگایەکدا، پێویستە ئیخلاص لە هەمویدا هەبێت، ئەگەرنا دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، ماڵی خراپیش سەر بە خاوەنەکەیەتی.

بەڵێ ئەگەر مرۆڤ نیەتی بۆ خوا ساغ بکاتەوە و دڵی پاك بکاتەوە و ڕاست بکات لە تەوبە کردنەکەی، ئەوە پەروەردگار یارمەتی دەدات و کار ئاسانی بۆ دەکات، و هەموو ئەو بەر بەست و ڕێ گرانەی دێنە ڕێی تەوبە کردنەکەی بۆی ئاسان دەکات و لای دەبات، کار ئاسانی وای بۆ دەکات بە خەیاڵیشیدا نەهاتبێت، چونکە هەر دڵێك کە تامی عیبادەتی چەشت، هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەوە بە تامتر و بە چێژتر و خۆشتر و شیرینتر نیە لەلای.

مرۆڤیش هەرگیز واز لە مەحبوب «خۆشویستراو»ێك ناهێنێت مەگەر بۆ یەکێکی لەو خۆشویستراوتر نەبێت.

خوای مەزنیش لە بارەی یوسفەوە علیە السلام دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ [يوسف:٢٤]. ((ئا بەو شێوەیەمان کرد بۆ ئەوەی هەرچی تاوان و خراپەیە لە یوسف دوور خەینەوە، بەڕاستی ئەو لە بەندە پاك و هەڵبژێردراوەکانی ئێمە بوو)).

بەڕاستی هەر کەس موخلیس و ساغ نەبێتەوە لە بۆ خوا، شەیتان دەبێتە فەرمانڕەوای دڵی، پڕی دەبێت لە خراپە و گەندەڵی.

هەر بۆیە دەبینی مرۆڤ پێش ئەوەی خوا بناسێت و تامی ئیخلاص بوون بۆ خوا و عیبادەت کردن بچەشێت، شوێنکەوتنی هەوا و ئـارەزو زاڵترە بەسەریدا، بەڵام هەر کە تامی ئیمان و ئیخلاصی چەشت و دڵی بە هێز بوو، دەبینی ئەم جار دڵی زاڵ دەبێت.

شێخ ئەحمەد بن عەبدولحەلیم -خوا بە ڕەحمەتی بکات و پلەی بەرز بکات لە بەهەشتی بەریندا- ئەڵێت: «مرۆڤ هەرکە موخلیص بـوو بـۆ خوا، خوا پاکی دەکاتەوە و هەڵی دەبژێرێت، دڵی زیندوو دەکاتـەوە و بۆ لای خـۆی ڕایدەکێشـێ، لـە هـەر شـتێکی تـری دژ بـەوە دووری دەخاتەوە. بە پێچەوانەی دڵێك کە بۆ خوا پاك نەبووبێتـەوە، تێبـینی دەکـەی ئـەم جـۆرە دڵانـە بـە بـەردەوامی خواسـت و ویسـت و خۆشەویستیەکی ڕەهـای تێدایـە، هەرچـی دای بـە لایـدا دڵـی بـۆی دەڕوات، هەرچیش دڵی بۆی ڕۆشت دەستی پێوە دەگرێت، هـەر وەکـو چڵەدار چۆن هەر بایەك هەڵیکرد لەگەڵی دەکەوێت و باکە چۆنی بـوێ ئاوها لاری دەکاتەوە، ئەمیش ئاوها، بۆیە جاری وا هەیە وێنە حەرام و غـەیرە حەرامـەکانیش دەیجـوڵێنن، تـا دەبێـت بـە یەخسـیر و کۆیلەی...، جاری واش هەیە دەبینی ناو وشۆرەت و کورسی و پلـە و پایە ڕایدەکێشن، تەماشا دەکەی لە قسەی ئەمەکە تورە دەبێت، بەڵام قسەی ئەوەکەی تری پێ خۆشـە، ئـەوەی ستایشـی بکـات لـە خـۆی نزیکی دەکاتەوە ئەگەریش قسەکەی ناهەق بێت، ئەوەشی سەرزەنشتی

بکـات دوژمنایـەتی دەکـات ئەگـەریش قسـەی هەقیشـی کردبێـت. هەندێك جاریش پارە و پوڵ سەر لە دڵ دەشـێوێنن و وای لـێ دەکـەن بیپەرستن..، جا هەر کەسێك بە خالصی بۆ خوا نەسـوڵحێت و نـەبێت بە بەندەی، دڵی بە تەنها ئەو خوا بێ شەریك و هاوتایە نەپەرسـتێت، بە شێوەیەك کە خوا خۆشەویستتر بێت لە لای لـە هەرشـتێکی تـر و زەلیل و گەردن کەچ بێت بۆی، وەگەرنا هەموو دونیـا کردویـەتی بـە بەندەی خۆی و شەیتانەکان زاڵ بوون بە سەریدا.. هەمووی کردویـەتی بە بەندەی خۆی، جا دڵ ئەگەر پاك نەبێت و بە تەنها ڕوو لەخوا نەبێت و ڕووی لە هەرچی شتی ترە وەر نەگێڕا بێت ئەوە هاوبەش دانەرە».

هەروەها ئیبن قەییمی مامۆستامان و قوتابی نزیکـی ئەحمـەد بـن عەبدولحەلیم -ڕەحمەتی خوا لە مامۆستاکە و قوتابیەکـەش- ئـەڵێت: «ئیمانداری موخلیص، لە خۆشترین گوزەراندایە، لـە باشـترین حـاڵ و باردایە، لە گوشادترین سینگدایە، لە ئاسـودەترین دڵدایـە، ئەمـەش بەڕاستی بەهەشتێکی پێش وەختە پێش بەهەشتە پاش وەختەکـە کـە بەهەشتی ئەبەدیە»

## دووەم: موحاسەبەکردنی نەفس

چونکە موحاسەبەی نەفس هاندەرە بۆ پەلە کردن بـۆ کـاری خێـر، هاوکارە بۆ ڕوو بە ڕووبونەوەی تاوان، یارمەتیدەرە بۆ گەیشتنە ئەوەی لە دەست چووە، پلەیەکە مرۆڤ وا لێ دەکات بزانێت چـی بـۆ هەیـە و

چی لەسەرە. هاویار هاوکاری مرۆڤە بۆ تەوبە کردن و بەردەوام بوون لەسەر تەوبە کردنەکەی.

یادی نەفسی خۆت بخەرەوە و ئامۆژگاری بکە و سەرزەنشتی بکە و بیترسێنە: پێی بڵێ: ئەی نەفس! بگەڕێوە پێش ئەوەی بمری؛ چونکە مردن لە ناکاو دێ، مردنی ئەم و ئەوی یاد بهێنەوە.. نازانی مردن مەوعیدی تۆیە؟! گۆڕ ماڵی تۆیە؟! خۆڵ فەرشی ژێری تۆیە؟! لەوێ کرمەکانی زەوی ئاشناکانی تۆیە؟! ناترسی فریشتەی گیان کێشان یەخەت پێ بگرێت و تۆش لەسەر تاوان کردن بەردەوامی -پەنا بە خوا-؟! لەو کاتەدا پەشیمانی دادت ئەدات؟! گریان و دڵ تەنگیت لێ وەردەگیرێت؟! تیا بچیت ئەی نەفس! پشت لە ئاخیرەت دەکەیت لە کاتێکدا ئەو ڕووی لە تۆیە و بەرەو تۆ دێت؟! ڕوو لە دونیا دەکەیت لە کاتێکدا ئەو پشتی لە تۆیە؟!

ئا بەو شێوەیە بە بەردەوامی موحاسەبەی خۆت بکە و سەرزەنشتی بکە و گلەیی لێ بکە و یادی بهێنەوە تا لە خوا دەترسێ و دەگەڕێتەوە بۆ لای و تەوبە دەکات -خوای مەزن تەوبەی ڕاستەقینە بە من و تۆش ببەخشێت-.

## سێیەم: خۆت لەو شوێنانە دوور بخەرەوە کە تاوانی تێدا ئەنجام دەدرێت

وازهێنان لەو جێگایەی پێشتر تاوانت تێدا ئەنجامــداوە یارمــەتیت دەدات بۆ تەوبە کردن، هەر بۆیە دەبینیت ئەو پیاوەی کە نەوەد و نــۆ کەسی کوشتبوو، کاتێك ویستی تەوبە بکات و ڕۆیشت بۆ لای زاناکە و پرسیاری لێ کــرد. زاناکــە پێــی ووت: «میلللەتەکــەت میللــەتێکی خراپن، جا لە فلانە شوێندا جێگایەکی ئاوها و ئاوها هەیە خەڵکێکی خوا پەرستن، بڕۆ بۆ لایان و لەگەڵ ئەواندا خوا پەرستی بکە»[1].

## چوارەم: واز لە برادەری خراپ بهێنە

لەبەر ئەوەی تەبیعەتت شت لەوان دەدزێت، بشزانە ئــەوان دەســت بەردارت نابن و وازت لێ ناهێنن، بە تایبــەت ئــەوان شــەیتانیان لــە پشتەوەیە، زۆر بە توندی و گەرمی هانیان دەدەن لە بۆ خراپــەکاری و تاوان، پاڵیان پێوە دەنێن و ڕایان دەکێشــن و پەلــە کێشــیان دەکــەن، ئاوها بەدبەختن بە دەست شەیتانەکانەوە -وەك خوای زانا لە قورئانــدا باسی لێوە کردوە-[2].

هەورەها ئەگەر توانیت ژمارە مۆبایلەکەت بگۆڕی وزانیت وات لێ دەکات تەوبە بکەیت وبەردەوام بیت لە سەری، بیگۆڕە، ئەگەر توانیت

(١) الحديث أخرجه البخاري في «صحيحه» (٣٤٧٠)، ومسلم في «صحيحه» (٢٧٦٦).

(٢) وەك خوای گەورە دەڵێت: {أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا} [مريم: ٨٣].

ناونیشانی ماڵەکەت بگۆڕی، بیگۆڕە، تەنانەت -ئەگەر توانیت- ئەو ڕێگایەش بگۆڕی کە پێشتر پێیدا هاتو چۆت دەکرد، زۆر چاکە...، کە وات کرد دڵنیا ببە پشت بەخوا ڕزگارت دەبێت لە شەیتانە مرۆییەکان.

## چیرۆکێکت بۆ دیگێڕمەوە بە هیوای پەند لێوەرگرتنی[(١)]:

گەنجێك تەوبە دەکات و ڕێگای ڕاست دەگرێتە بەر، دەست دەکات بە نوێژ کردن، ڕۆژوی سوننەت گرتن، تەنانەت دەست دەکات بە لەبەر کردنی قورئان... کە خۆی ئەبینێت لەم ژیانە پڕ تام و چێژە، لەم دونیا پڕ خۆشیە، هەندێك برادەری پێشوی خۆی بیر دەکەوێتەوە کە هێشتا لە گێژاوی بێ ئاگایی و دونیای ئارەزوو بازیدا دەتلێنەوە، حەزی کرد لەوەی خۆی پێی گەیشتووە بەهرەمەندیان بکات، ئەوانیش سواری ئەم کەشتیە ڕزگارکەرە ببن، ئەوانیش بێنە ڕیزی تۆبەکارانەوە. ڕۆیشت سەردانی کردن، بەس شەللا نەڕۆشتایە..

ئەمەش ئامۆژگاریمانە بۆ هەموو ئەوانەی تازە تەوبەیان کردوە، تازە ئیلتیزامیان وەرگرتووە، با هەرگیز بە تەنها سەردانی هاوڕێ خراپە کۆنەکانی خۆیان نەکەن، بایەکێك ببەن لەگەڵ خۆیان کە

---

(١) خالد ڕاشد لە شریتی «أحوال الغارقين»دا باسی دەکات، ئەڵێ: پێم گەیشتوە...

هاوکاریان بێت و کار ئاسانیان بۆ بکات، نەوەك تیا بچن، چونکە زۆری لە زیرەکی ئەباتەوە.

سەردانی کردن بە مەبەستی هیدایەتدانیان، بەڵام ئەم هاوڕێ خراپانە، دەستیان کرد بە هێرش کردن، هەر کەسە و تیرێکی تێ دەگرت، تەعلیقیان لێ دەدا و ئەوسایان بیر دەهێنایەوە، فلانە ڕۆژ و فیسارە ڕۆژت لە بیر نایەت؟! ئاوها و ئاوهات لەگەڵمان نەکرد...؟! بە دەنگی بەرز و بە قاقا پێ دەکەنین، ئەویش لایان هەستا، بەڵام دوای چی؟! دوای ئەوەی هەندێك شتیان لە دەرونیدا دروست کرد، دیسانەوە کێشمەکێشی دەرونی لە ناخیەوە دەستی پێ کردەوە.

دوای چەند ڕۆژێك هاتن بۆ لای و وتیان: ئەمانەوێ سەفەرێك بکەین بۆ ئەم نزیکانە بە مەبەستی کڕینی ئۆتۆمبیلێك، جا حەز ئەکەین یەکێکمان لەگەڵت بێت خوامان یاد بخاتەوە و پێش نوێژیمان بۆ بکات و فێری قەصر و جەمعمان بکات.

ببینە شەیتان و دار و دەستەکەی چۆن ئەیەوێت لە دەرگای خێرەوە توشی خراپەت بکات؟!

ئەوەبوو شەیتان سەفەر کردنی لاخۆش و جوان کردەوە، بۆیە ڕازی بوو، بەڵام شەللا ڕازی نەبوایە...

ئەو شوێنەی ئەوان بۆی چوون بە ئاشکرا سەرپێچی خوای مەزنی تێدا دەکرا، لەوێ ئوتێلێکی خۆشیان بە کرێ گرت و وتیان تۆ لێرە بمێنەوە و خۆیان ڕۆیشتن دەستیان کرد بە پیلان گێڕان کەوا چۆن بیگێڕنەوە بۆ ڕێگای گەندەڵی و چەوتی و سەرپێچی خۆیان.

ئەو شەوەیان لە نێو گۆرانی و عارەق خواردن و ئافرەتی داوێن پیسدا بردە سەر، ئەو هەژارەش لەوێ چاوەڕێی دەکردن.

ڕۆیشتن لەگەڵ یەکێك لەو داوێن پیسانەدا ڕێککەوتن لەسەر هەرچیەك دەیەوێت، پارەی چەند بار پێ دەدەن، بەس بتوانێت ئەو هاوڕێیەیان لە خشتە بەرێت و کاری خراپەی لەگەڵدا بکات.

الله أكبر... ئەو ڕۆیشت هیدایەتیان بدات وڕێنماییان بکات و ڕێی خوایان نیشان بدات، بەڵام ئەمان نەخێر، ئەیانەوێ ئەوەی بەسەر بهێنن... سەری لە زینا کردنەوە دەر بکەن، تەنانەت ماڵی خۆشیان لەو پێناوەدا دەبەخشن، بڕوانە هاوڕێی خراپ چۆنە!؟ بردیان بۆ لای، ئەویش کاسێتێك گۆرانی و عارەقی لەگەڵ خۆی برد.

جا عارەقیش عەقڵ ناهێڵێ، مۆسیقاش بەریدی داوێن پیسیە.

هەر دوو لا تەنیا کەوتن. هیچ کوڕ و کچێکیش تەنیا ناکەون مەگەر شەیتان سێیەمیانە[1].

بەردەوام هەر فریوی دەدا، هەتا پەرداخێك عارەقی بەخۆرد دا، پاشان یەکێکی تر و پاشان یەکێکی تریش، پاشان حەرامەکەش ڕویدا و شەرواڵ پیسی لەگەڵدا کرد -خوا پەنا بدات-.

ئەو بینایەی کە ماوەیەکی ڤۆرە شەکەت وماندوو بووە تا بونیادی ناوە، بەڵام بەدەستی خۆی ولە ساتێکی زۆر کەمدا ڕوخانی.

پاشان خەوتن.. هەر بەو حاڵە و بەو سەر خۆشی ولەش گرانی زیناوە -خوا پەنا بدات-.

کە بەیانی بوویەوە شەیتانە مرۆییەکان -هاوڕێ خراپەکانی- زوو هاتن و دایان لە دەرگا. قاقای پێکەنینیشیان ئەو ناوەی داگرتبوو.

ئەو داوێن پیسە زینا کەرە دەرگاکەی بۆ کردنەوە.

وتیان: ها چیت کرد؟! دەنگ و باس؟! مژدەی چیت پێیە؟!

---

(١) بەشێکی فەرمودەیەکی صەحیحە کە تورمزی وئەحمەد دەیگێڕنەوە بە سەنەدێکی **صەحیح:** أخرجه الترمذي في «جامعه» (٢١٦٥)، وابن ماجه في «سننه» (٢٣٦٣)، وأحمد في «مسنده» (١١٥، ١٧٩).

ئەویش وتی: مژدەتان! لێ بیت، هەموو شتێکی کرد، عارەقی خوارد، پاشان زینای کرد و پاشان خەوت... ئەوەتا بە ڕووتی لە نێو جێگاکەی خەوتوە.

ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ لای بە پێکەنین و تانە و تەعلیق وەشاندنەوە، بۆ ئەوەی بیداری بکەنەوە لە جێگاکەی خۆی.

بیداریان کردەوە... فلان کەس... فلان کەس...؟!

وەلامی نەدایەوە..!

دیسانەوە بانگیان لێ کردەوە... فلان کەس.. فلان کەس...!

ئەم لایان پێ کرد.. ئەو لایان پێ کرد.. هەڵیان گەڕانەوە.. نەخێر سودی نییە و وەلام ناداتەوە...

تەماشای ئەم موسیبەتە بکە...:

عارەقی خواردوە و زینای کردوە و خەوتوە و هەر ئەو شەوە مردوە لەسەر جێگەکەی... إِنَّا لِله وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُون...

ئەمانە چ برادەرێکن.. بۆ مەگەر نەڕۆیشت هیدایەتیان بدات...؟!

هەر بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «المَرْءُ عَلَىٰ دِينِ خَلِيلِهِ؛ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ»(1). «مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێ

(١) أخرجه أبو داود في «سننه» (٤٨٣٣)، والترمذي في «جامعه» (٢٣٧٨)، وأحمد في «مسنده» (٨١٤٣، ٨٥٣٣)، والطيالسي في «مسنده» (٢٦٩٦)، وعبد بن حميد في «المنتخب» (١٤٣١).

قال الترمذي: «هذا حديث حسن غريب». وصححه الحاكم والذهبي والنووي، وحسنه الألباني. وقال الأرناؤوط: «إسناده جيد، رجاله ثقات رجال الشيخين غير موسىٰ بن وردان... وهو صدوق». (٨٤١٨).

گیان بە گیانیەکەیەتی، جا بۆیـە وریـا بـن! بـزانن هاوڕێیـەتی کـێ دەکەن و کاتەکاتتان لەگەڵ کێدا بە سەر دەبەن».

کە ئەڵێم برادەری خراپ هەموان بیریان بۆ ئەو هاوڕێ و برادەرانـە ئـەڕوات کـە بـەرەو عـارەق خـواردن و جگـەرە کێشـان و مـاددە هۆشبەرەکان و داوێن پیسی و باقی تاوانە ناسراوەکان تر.

بەڵێ بێگومان ئەمانە بردارەی خراپن و زۆریـش خـراپن و سـەری موسڵمان لەو بەڵا گەورانەوە دەر دەکەن، بەڵام برادەری خراپتر هەنـە، بە خوا زۆر لە ئەمانە خراپتریشن، ئەوانەش بریتین لەو کەسـانەی کـە بیر و بۆچوون و عەقیدەیان گەنیووە، پڕ مێشکیان لە شوبهەیە.

جا ئەصڵی کردنی تاوان یان شوبهە و بیر و بۆچونە یان شەهوەت و هەوا و ئارەزووە، جا ئەوەیان کە لەبەر شوبهە و عەقیدەیە زۆر خراپترە لەوەیان کـە لەسـەر شـەهوەت و هـەوا و ئـارەزوە، تەنانـەت کـەمتر ئومێدی تەوبە کردنی لێ دەکرێت، درەنگتر و گرانتریش تەوبە دەکات. هەر بۆیە ئەبێت زۆرتر خۆپارێزی لە کۆمـەڵی یەکـەمیان بکرێـت تـا کۆمەڵی دووەمیان، ئەمەش بـەبێ بەکـەم تەماشـا کردنـی کۆمـەڵی دووەم، چونکە دووەمیشیان بەریدی یەکەمیانە.

## پێنجەم: بیر لە سەر ئەنجام (عاقیبەتـ)ـی و زەرەر و زیانی تاوانەکان بکەرەوە

چونکە ئەگەر مرۆڤ زانی تاوانەکان عاقیبەتیان خراپە و داهاتوویان ڕەشە، سزاکەی لە بۆسەدایە و چاوەڕێیەتی، وای لێدەکات پێش هەموو شتێك واز لە تاوانکردن بهێنێت و تەوبە بکات لە تاوانەکان.

تاوان و سەرپێچی زەرەر و زیانەکانیان زۆر زۆر گەورەیە، سزاکانیان هەمە جۆرە، ئیتر چی لە دونیا بێت یان لە دوارۆژ، لەسەر ئاستی تاکەکان بێت یان لەسەر کۆمەڵگاکان، لەوانە، بە کورتی[1]:

### یەکەم: بێ بەش بوون لە زانستی شەرعی

جاری وا هەیە موسڵمان زانستێکی لە بیرەوە دەچێت بەهۆی تاوانەوە، هەندێ لە سەلەف دەفەرمون: «دوای چل ساڵ قورئانم لە بیرەوە چوو، وا هەست دەکەم بە هۆی تاوانێکەوە بوو پێش چل ساڵ ئەنجامم داوە».

شافیعی دەفەرموێ:

به وەکیعم وت: بیرم گۆڕاوە — ووتی: تاوانە لێتی تێکداوە
هەروا پێی وتم: زانست نوورە — نووریش لە تاوان کارەوە دوورە

---

(١) بۆ درێژەی ئەم بابەتە، بڕوانە کتێبی: «زیانەکانی تاوان وخۆ پاراستن لێی» هی نووسەر، خوا لێی خۆش بێت.

هەروەها پیاوێك پرسیار لە مالك دەكات ئەڵێت: «چی باشە بۆ شت لە بەر كردن، ئەویش فەرموی: ئەگەر شتێك باش بێت، بریتیە لە وازهێنان لە تاوان».

## دووەم: بێ بەش بوون لە ڕۆزی یان كەمبوونەوەی

وەك لە فەرموودەیەك دا هاتووە پەیامبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموێ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِالذَّنْبِ يُصِيبُهُ، وَلَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ، وَلَا يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلَّا الْبِرُّ». «كەسی وا هەیە لە ڕۆزیەك بێ بەش دەبێت بە هۆی تاوانێكەوە ئەنجامی داوە»[1]. جا چۆن تەقوای خوا ڕۆزی هێنەرە، لە خوا نەترسانیش بە هەمان شێوە ڕۆزی بڕ وهەژار خەرە.

مەحروم بوونیش لە ڕۆزی یان بن بڕ كردنیەتی، یان كەمكردنەوەیەتی، یان نەمانی پیت وفەڕ وبەرەكەتە. عەبدوڵای كوڕی عەبباس ئەڵێت: «چاكە كردن ڕووناكیەكی هەیە لە دەم وچاو دا، نورێكی هەیە لە دڵ دا، وفراوانی هەیە لە ڕۆزی دا، وهێزی لاشەیە، هەروەها خۆشەویستت دەكات لە دڵی خەڵكدا، تاوان كردنیش ڕوو ڕەش دەكات، ودڵ تاریك دەكات، لاشە بێ هێز دەكات، وڕۆزی كەم دەكات، وڕق لێبوونی تاوانبار دەخاتە دڵی خەڵكیەوە»...

(١) أخرجه ابن ماجه في «سننه» (٩٠)، وأحمد في «مسنده» (٢٢٨٢١).
قال محققو المسند: «حسن لغيره دون قوله: «إن الرجل...»».

خوای میهرەبان ئەفەرموێ: {وَمَن يَتَّقِ اللهَ يَجعَل لَّهُ مَخرَجاً وَيَرزُقهُ مِن حَيثُ لاَ يَحتَسِبُ} [الطلاق:٢]. «هەر کەس خۆی لە تاوان بە دوور بگرێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە ولە لایەکەوە ڕۆزی دەدات کە بە مێشکی دا نەهاتبێت».

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە ڕەحمەت بێت وەفاتی کرد ویازدە منداڵی بە جێهێشت وهەموو وەرەسەکەی حەڤدە دینار بوو" پێنجی خەرج کرا بۆ کفنەکەی، شوێنی قەبرەکەشی بە دوو دینار، وباقیەکەشی بە سەر منداڵەکانی دا دابەش کرا، هەر منداڵێکیشی تەنها نۆزدە درهەمی بەر کەوت. لەولاشەوە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك وەفاتی کرد ویازدە کوڕی بەجێهێشت، کە میراتەکەی دابەش کرا هەر یەکەیان ملیۆنێکی بەرکەوت.

لە کاتێك دا یەکێك لە منداڵەکانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزم بینی لە یەك ڕۆژدا سەد ولاخی کردە ڕێی خوا بۆ تێکۆشان، وە یەکێك لە منداڵەکانی هیشامم بینی خەڵك خێری پێ دەکرد.

هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك بۆ هەر یەکێك لە منداڵەکانی ئەو هەمووە زێڕەی بە جێهێشتووە بەڵام بەتاڵ لە تەقوای خوا. ئەوە ئەبێت دواجار منداڵەکانی عومەری عەبدولعەزیز لە پێناوی خوا ئەوەندە پارەیان زۆرە یارمەتی سوپای ئیسلام دەدەن لە جەنگەکانی دا، بەڵام منداڵەکانی هیشام ئەڵێن: لە سەردەمی ئەبو جەعفەری مەنسور

سوالّیان کردووه وتوویانه: له ڕێی خوا لەو ماڵەی خوا پێی داون بێ بەشمان مەکەن.

### سێیەم وچوارەم: هەستکردن بە وەحشەت ونارەحەتی

تاوانکار لە دڵی دا هەست بە ئازار وتەنیایی وسامناکی وپەڕاگەندەییەکی بێ وێنە دەکات، هەست بە نارەحەتی وناهۆگری دەکات، هەست دەکات ئەم دونیایەی لێ هاتۆتەوە بە یەکدا. چ لەگەڵ خەڵك، وچ لەگەڵ خوادا.

جارێك پیاوێك سکاڵای ناخۆشی ونارەحەتیەکی کرد کە لە دڵیدا هەستی پێ دەکرد، زانایەك پێی وت:

گەر نارەحەتی دەستی تاوانی ئاسودە ئەبی، بە واز هێنانی
تاوانت کرد، خەمباری کردی دە چاکە بکە، با ئاسودە بی

هەندێ لە سەلەف دەفەرمون: «کە تاوان ئەکەم لە مامەڵەی خێزان ومنداڵ وئاژەڵەکەشم هەستی پێ دەکەم».

### پێنجەم: کارەکانی لەسەر قورس وگران دەبێت

ئیشەکانی بە ئاسان ناڕوات بەڕێوە، دەست بۆ چی دەبات، بۆ هەر شوێنێك دەڕوات هەست دەکات دەرگاکانی لەسەر داخراوە.

### شەشەم: هەست کردن بە تاریکیەکی ڕاستەقینە لە دڵیدا

وەك چۆن هەست دەکات بە ڕەشی شەوی تاریك، جا تاوان لەسەر دڵی وەك تاریکیە. ئەم تاریکیە جاری وا هەیە بە هێز دەبێت تا لە

ناو چاوانیشی هەست بە ڕەشی ڕووی دەکرێت وهەمو دڵ ساغێك دەیبینێت.

### حەوتەم: تاوان دڵ ولاشە لاواز دەکات

سەبارەت بە یەکەم ئەوە حاشا هەڵنەگرە وئاشکرایە کە بەردەوام لاوازی دەکات تا ژیانی تێدا ناهێڵێت. سەبارەت بە دووەم: بڕوادار هێزی لە دڵیەوەیەتی، جا تا دڵی بەهێزتر بێت لاشەشی بەهێزتر دەبێت.

بەڵام مرۆڤی خراپەکار ئەگەر لاشەشی بەهێز بێت لە حەقیقەت دا لاوازە، دڵی لاوازە.

### هەشتەم: بێبەش بوون لە تاعەتی خوای میهرەبان

تاوان خاوەنەکەی لە عیبادەت کردنی پەروەردگار بێ بەش دەکات، جا ئەگەر تەنها ئەم زیانەی هەبێت هەقە کەسی ژیر لە تاوان دوور بکەوێتەوە.

### نۆیەم: تاوان تەمەن کورت دەکاتەوە وبەرەکەتی ناهێڵێت

کە تاوان تاوانێکی تر بە دوای خۆیدا بهێنێت، ئەوسا ژیانی تاوانکار کورت دەبێتەوە وبریتی ئەبێت لە تاوان، دەی ژیان وتەمەنی ڕاستەقینە ئەوەیە لەگەڵ خوادا بێت کەواتە ئەم کەسە تەمەنی بە فیڕۆ چووە.

گومـانی تێـدا نیـه تـاوان تەمـەن کـورت دەکاتـەوە وبەرەکـەتی ناهێڵێت، جا چۆن چاکە کردن وەك پەیامبەر ﷺ دەفەرموێ: «لە تەمـەن زیـادە دەکـات». کەواتـە خراپـەکاریش تەمـەن کـورت دەکاتەوە.

### دەیەم: تاوانی تر بە دوای خۆیدا دەهێنێت

تا وای لێ دێت کابرا ناتوانێـت وازی لـێ بهێنێـت. هەنـدێك لـە پێشینان ئەفەرموون: «لە سزای تاوان کردن ئەوەیە: تـاوانی بـە دوای خۆیدا دەهێنێت. ولە پاداشتی چاکەکردن ئەوەیە چاکە بە دوای خـۆی دا دەهێنێت». هەربۆیە پەیامبەر ﷺ ئەفەرموێت: «بە دوای خراپە چاکە بکە. بۆ؟ تا کۆنەبێتەوە ولە ناوی بەرن».

### یانزەهەم: ناشیرینی تاوان، لە دڵ دا ناهێڵێت

زیـانێکی تـری تـاوان کـردن ئەوەیـە: ناشـیرینی تـاوان لـە دڵ دا ناهێڵێت، ووەك خووی لێ دەکات. تا وای لێ دەکات گوێ لە بینـینی خـەڵك وقسـەیان نـادات. بـەڵکو جـاری واش هەیـە بـە خۆشـحاڵی وکەیفەوە بە خراپەکارەکەی هاوڕێی ئەڵێت: وا ووام کرد!

### دوانزەهەم: تاوان بەندە لەبەر چاوی خوا دەخات

تاوان کردن هۆکارە بۆ ئەوەی تاوانکار سـووك بێـت لـەلای خـوا، ولەبەر چاوی بکەوێت، گەورەترین زەرەرمەندیش ئەوەیە بەنـدە لەبـەر چاوی خوا بکەوێت. جا کاتێك ڕوو دەکاتە خوای میهرەبان لای خـوای

دانا زۆر بەڕێز ئەبێت، هەر بۆیە سەیری دەکەی شێوەی زۆر جوانە، نور ورِوناکی لە چاوی ئەبارێ. ئەبو سولەیمانی دارانی ئەڵێت: «سوك وکەم بوون لەلای خوا بۆیە وێڵی کردن تا تاوانەکان بکەن. ئەگەر لای خوا بەڕێز ببوایەن ڕێگری لێ دەکردن».

## سیانزەهەم: تاوانکردنت لا سوك وئاسان دەکات

هەروەها بەندە هەر تاوان دەکات تا وای لێ دێت تاوانی لا سوك وئاسان دەکاتەوە، ولە دڵیشی بچوك دەبێتەوە. کەییش گەیشتە ئەمە، ئەوە نیشانەی تیاچوونیەتی -خوا پەنا بدات-. تاوانیش تا لە چاوی بەندە بچوك بێتەوە لای خوا گەورە ئەبێتەوە وهەتا لای گەورە بێتەوە لای خوای مەزن بچوك دەبێتەوە وەك سەلەف دەرفەمون.

گەنج هەیە ئەڵێت: کاتێك یەکەم جار ڕۆیشتم ئیشی دەستم کرد. ئەڵێ: هەتا یەك هەفتە بەس دەگریام ونالەم بوو" خوایە! تەوبە، خوایە! هەڵەم کرد.

جاری دووەم: هەم تۆزێ دەگری، جاری سێیەمیش.

ئیتر جاری چوارەم وپێنجەم بێ تاقەتی بێ گریان

پاشان دڵ تەنگیەکەشی لاواز دەبێت.

پاشان دەبێت بە شتێکی ئاسایی وداوای لێ بووردنیشی لەسەر ناکات، بیشی کات تەنها بەدەمە، -پەنا بەخوا وخۆیشی باشترین پەنایە-.

ئا ئەمەیە دۆڕان، تاوان لە دوای تاوان هەڵە لە دوای هەڵە کەڵەکە ئەکات. تا ڕۆژێك بەر دەبنەوە ودەدەن بە سەریدا.

### چواردەهەم: شومیەکەی دەگەڕێتە بۆسەر غەیرە خۆیشی

شومی وغەڕی تاوانەکەی دەگەڕێتە بۆسەر خۆی وجگە لە خۆیشی لە خەڵك وئاژەڵان جا هەر خۆی نا جگە لە خۆیشی بە هۆی تاوانەکەیەوە دەسوتێت.

ئەبو هورەیرەی ئەڵێت: «تاوانبار تەنها زیان بە خۆی ناگەیەنێت! بەڵکو ئاژەڵی چێرگ لە هێلانەکەی خۆیدا دەمرێت بە هۆی ستەمی ستەم کارەوە».

### پانزەهەم: مرۆڤ زەلیل وسەر کز وسەر شۆڕ دەکات

تاوان کردن مرۆڤ سەر شۆڕ وزەلیل وسەر کز دەکات چونکە هەموو سەر بەرزیەك لە گوێڕایەڵی کردنی خوادایە.

عەبدوڵای کوڕی موبارەکیش ئەفەرموێ:

سەیری تاوان کە، دڵ مرێنەرە     خو پێگرتنیش، سەر کزکەرە
ژینی دڵانە، وازی لێ بێنی     بۆ خۆت باشترە لە قسە دەرچونی
بۆ کێ خراپی، کردوە دینەکان     مەگەر پادشا و، زانا وعابدەکان

**شانزەهەم: عەقڵی وبیر وهۆشی مرۆڤ لای خۆی ناهێڵێت**

تاوان کردن عەقڵی مـرۆڤ تێـك دەدات، بـیر وهۆشـی ئەشـێوێنێ، چـونکە عـەقل ڕووناکیـەکی تێدایـە، تـاوان ئـەو نـور وڕوناکیـە ئەکوژێنێتەوە. مەبەستیشمان ئەو عەقڵەیە هەقی پێ ببینیت.

پێشینان دەفەرمون: «کەس سەرپێچی ناکات مەگەر لـەو کاتـەی عەقڵی لای خۆی نەمابێت».

**حەڤدەهەم: ئەبێتە مایەی مۆردان بەسەر دڵ**

تاوان کە زۆر بوو، ئەبێتە مایەی مۆردان بەسەر دڵی خاوەنەکەیـدا -خوا پەنامان بدات-، وەك خوای دانا ئەفەرموێ: {كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَي قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ} [المطففين:١٤]«نەخێر ئەوانە مۆر دراوە بەسـەر دڵیاندا، بە هۆی ئەو تاوانانەی ئەنجامیان داوە...» واتە: کاتێك تاوان و سەرپێچیەکانیان زۆر بوو دەوری دڵیانی گرتووە بۆیە مـۆردراوە بـە سەری دا.

ئیبن عەبباس ئەڵێ: ئەمە بریتیە لە تـاوان کـردن لـە دوای تـاوان کردن بێ هیچ داوای لێ خۆشبوون کردنێك. بـێ ئـەوەی بڵـێ: خوایـە هەڵەم کرد کرد! لێم ببورە!

**هەژدەهەم: بەندە تووشی نەفرەتی خوا دەکات**

لە شەرعیشدا نەفرەت لە کۆمـەڵێك کـار کـراوە. هەنـدێك کـاری تریش هەیە، لەو نەفرەت لێکراوانـە لـە پێشـترە کـە نەفرەتکردنەکـە بیگرێتەوە، جا لەو کار وکەسانەی نەفرەتی لێکراوە:

١- دز.

٢. ئەوەی مارە بە جاش دەکا.

٣. ئەوەشی بۆی دەکرێ.

٤- وێنەگران.

٥- ئەوەی سەربڕین بۆ جگە لە خوا دەکات.

٦- ئەوەی نەفرەت لە دایك وباوکی خۆی دەکا.

٧- ئەوەی ئاژەڵێك بکاتە نیشانەشکێن.

٨- ئەوەی نیشانە وسنوری ئەرزەکان دەگۆڕێت.

٩- ئەوەی ئیشی نێربازی بکات.

١٠- ئەوەی جنێو بە دایك وباوکی خۆی بدات.

١١- ئەوەی ناوچەوانی ئاژەڵ داخ بکات.

١٢- ئەوەی ژنێك لە پیاوێك هەڵگەڕێنێتەوە.

١٣- ئەوەی لە کۆمەوە بڕواتە لای ژنەکەی.

١٤، ١٥- خاڵ کوت وئەوەشی داوای بکات.

١٦، ١٧- ئەوەی قژی دەستکرد دابنێ ئەوەشی داوای دانانی بکات.

١٨، ١٩- حەفەکەر وئەوەشی داوای کردنی دەکات.

٢٠، ٢١- ئەوەی دان تەنك وشاش دەکات وئەوەشی داوایکردنی دەکات.

٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥- سـوو خـۆر ووەكيلەكـەی ونووسـەرەكەی وشاهیدەكانیشی.

٢٦، ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣، ٣٤، ٣٥- مەی خـۆر، وساقیەكەی، وگوشێنەرەكەی، وئەوەشی داوای دەكات، وكڕیارەكـەی، وفرۆشـیارەكەی، وئەوەشـی بـۆی دەكڕدرێـت (وئەوەشـی بـۆی دەفرۆشرێت)، وئەوەی نرخەكەی دەخـوات، وئەوەشـی بـاری دەكـات، وئەوەشی بۆی بار دەكرێت.

٣٦، ٣٧- ئـەو ئافرەتـەی خـۆی ئەچـوێنێت بـە پیـاوان وبـە پێچەوانەشەوە.

٣٨- ئەوەی فەرتەنەیـەك دەنێتـەوە یـان ئـەوەی فەرتەنـە چـیەك ئەگرێتە خۆی (مٙنءأحدپ حدٙپًا أو یٙوی مُحدِپًا)).

٣٩- ئەوەی كوێرێك لە ڕێگادا وێڵ دەكات.

٤٠- ئەوەی لەگەڵ ئاژەڵ جووت ببێت.

٤١- ئەوەی زیان لە موسڵمانێك بدات یا فێڵی لێبكات.

٤٢- ئەو ئافرتـەی زۆر ئەڕواتـە سـەر قـەبران وئـەوەی مزگـەوت لەسەر قەبران دروست دەكات، وچرای لەسەر دادەگیرسێنێت.

٤٣- ئەو ئافرەتەی شەوێك تا بەیانی پشت لە پیاوەكەی بكات.

٤٤- ئەوەی خۆی بداتە پاڵ غەیرە باوكی.

٤٥- ئەوەی ئاسنێك بە ڕوی موسڵمانێكدا بەرز بكاتەوە.

٤٦- ئەوەی جوێن بدات بە هاوەڵانی.

٤٧، ٤٨، ٤٩- ئەوەی خراپەکاری بکات لەسەر زەوی، وسیلەی ڕەحم بپچڕێنێت. وئازاری پەیامبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بدات.

٥٠- ئەوەی بەڵگەکانی دین دەشارێتەوە.

٥١- ئەوەی تۆمەتی زینا بداتە پاڵ ئافرەتێکی داوێن پاکی بێئاگا.

٥٢- ئەوەی ڕێبازی بێباوەڕانی لە ڕێبازی بڕوادارانی پێ باشتر بێت.

٥٣- بەرتیل خۆر، ووەرگرەکەی، وواسیتەکەشی.

ئەمانە هەر هەمووی نەعلەتی لەسەر هاتووە، شتانێکی تری جگە لە مانەش نەفرەتی لێکراوە.

## نۆزدەهەم: بێبەش بوون لە دوعای پەیامبەر ﷺ وفریشتەکانیش

لە قورئان وسوننەت دا هاتووە فریشتە دووعا بۆ موسڵمانان دەکەن، جا بەندە ئەگەر لەسەر تاواندا، ڕاهات ئەوجا دووعای فریشتەکان نایگرێتەوە.

## بیستەم: تاوانکردن جۆرەها خراپەی لە ئاو وهەوا وکشتوکاڵ وبەروبوومی لێ دەکەوێتەوە

تاوان لەسەر زەوی دا جۆرەها خراپی لە ئاو وهەوا وکشتوکاڵ وبەروبوومی لێ دەبێتەوە. خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: {ظَهَرَ

الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ [الروم:٤١]. «خراپه له دەریا ووشكانی دا دەركەوتووە بەهۆی تاوانی دەستی خەڵكیەوه». موجاهید ئەڵێت: كه دەسەڵاتداری ستەمكار ستەم وخراپه دەكات، به هۆیەوه خوا باران دەگرێتەوە ودەغڵ ودان وكشتوكاڵ ووەچه له ناو دەدات، خوای گەورەش خراپەكاری پێ خۆش نیه، پاشان ئەو ئایەتەی پێشووی خوێند. وئینجا ووتی: والله مەبەست له دەریا ئەو دەریا نیه ئێوه دەیزانن، بەڵكو هەموو شارێك لەسەر ئاو بێت ئەوە دەریایه.

## بیست ویەكەم: تینی غیرەت له دڵدا دادەمركێنێتەوە

له زیانەكانی تری تاوان: ئاگری غیرەت له دڵدا دەكوژێنێتەوە. كه ژیان وچاكی دڵ به به غیرەتەوە بەندە. غیرەت (غەیره) كردن تین وئاگری لاشەیه كه پیسی وگەرد وسیفەته خراپەكان ناهێڵێت، وەك چۆن تینی كوره پیسی وگەردی زێڕ وزیو وئاسن دەردەكات.

جا بەڕێزترین خەڵك بەغەیرەترینه هەر بۆیه پەیامبەر ﷺ به غیرەتترین كەس بووه. خوای گەورەش له هەمووی به غەیرەترە، هەر بۆیه غەیره دەكات كاتێك بەندەكەی زینا دەكات. هەر لەبەر ئەوەشه خوای دانا خراپەكاری به هەموو جۆرەكانیەوه حەرام كردووه.

## بیست ودووهەم: شەرم وحەیا ناهێڵێت

له زیانەکانی تری تاوان: لاواز دەکات تا به یەك جاری بەنده له خۆی دایدەماڵێت، وتەنانەت گرنگ نیه به لایەوه خەڵك بیبینن وخۆیشی باسی خراپەکانی خۆیان بۆ دەکات. تاکه هۆکاری ئەمەش دارمانه له شەرم وحەیا. شەرمیش بنەمایه بۆ ژیانی دڵ، بنەرەتی هەرچی خێره، نەمانیشی، نەمانی هەموو خێرێکه. حەیاش له حەیاتەوه هاتووه کێ حەیای نەبێ حەیاتیشی نیه.

## بیست وسێهەم: گەورەیی خوا له دڵ دا لاواز دەکات

موسڵمان خوای زۆر لا گەورەیه، جا تاوان وا دەکات خوای له دڵ دا لاواز بێت. جا ئەگەر بەنده خوای له دڵ دا گەوره بێت جەسارەت (جورئەت) ناکات سەرپێچی بکات.

## بیست وچوارهەم: ئەبێته مایەی ئەوەی: خوا، تاوانکار بدات به دەست نەفسی وشەیتانەوە

له زیانەکانی تری تاوان: ئەبێته مایەی ئەوەی خوا بەنده له یاد بکات، ووازی لێ بهێنێت وبیداته دەست نەفسی خۆی وشەیتانەوە. ئەمەش ئەو تیاچوونەیه که ئومێدی ڕزگار بوونی تێدا نیه. خوای دانا ئەفەرموێ: {وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ} [الحشر:١٩]. «وەکو ئەوانه مەبن که خوایان له بیر کرد. خواش سزای دان وخۆیانی له بیر خۆیان بردەوە».

بەڕاستی لە گەورەترین سزاکان ئەوەیە بەندە خۆی لە بیر بکات وئیهمالی بکات، وبەشی خوا نەدات وبڕوات بیگۆڕێتەوە وبیفرۆشێتەوە بە نرخێکی کەم. ئەڕوا ئەوە لە دەست دەدات کە هیچ کات لێی بێنیاز نیە وکەس جێی ئەوی بۆ پڕ ناکاتەوە، ئەیگۆڕێتەوە بەوەی هیچ پێویستی پێی نیە ولێی بێنیازە:

هەرچی لە دەستچیٚ جێی پڕ ئەبێتۆ    تەنها خوا نەبێت جێی پڕ نابێتۆ

چی زایە ئەبێت ببێت ئاسانە    جگە لە الله قورس وگرانە

**بیست وپێنجهەم: نیعمەت وخۆشیەکان ناهێڵێت وسزا دەهێنێت**

تاوان نیعمەت وخۆشیەکان ناهێڵێت وتوڕەیی وسزای خوا دێنێت. بشزانە هیچ نیعمەت وخۆشیەك لە دەست بەندە ناچێت مەگەر بە هۆی تاوانێکەوە، وهەرگیز تووشی هیچ سزایەك نابێت مەگەر بە هۆی تاوانێکەوە. وەك عەبباسی کوڕی عەبدولموتەللیب فەرموی: هیچ بەڵایەك دانابەزێت مەگەر بە هۆی تاوانەوە، ولاش ناچێت مەگەر بە تەوبە کردنەوە. پەروەردگاریش ئەفەرموێت: {وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ} [الشوري:٣٠]. ((هیچ موسیبەتێکتان بەسەردا نایەت مەگەر بە هۆی تاوانی دەستی خۆتانەوە)).

جوان بیپارێزە نیعمەتەکان خوا    تاوانەکانت سەر نیعمەت ئەخوا

تاعەت خوا کردن قەڵغان نیعمەتن          گەرنا سزای خوا زۆر خێرا وتوندن

ئامان دورکەوە لە زوڵم وستەم          چونکە سەرەنجام بە هیلاکتەبەن

جا تاوان ئەو نیعمەتانەی ئێستا هەن نایهێڵێت، وئەوەشی دێت ناهێلێت.

## بیست وشەشهەم: ترس ودڵەڕاوکێی بۆ دروست ئەبێت

لە سزاکانی تاوان: ئەو ترس وبیم ودڵەڕاوکێیەیە لە دڵی تاوانکاردا دروست ئەبێت. هەمیشە ئەیبینیت دەترسێت وڕاڕایە. بۆیە تاعەتی خواکردن قەڵای هەرە مەزنی خوایە هەر کەس بڕواتە ناویەوە لە ئەماندا ئەبێت لە سزای دونیا ودارۆژ، کێش لێی بڕواتە دەرەوە ترس لە هەموو لایەکەوە دەوری دەدات. جا هەر کەس لە خوا بترسێت، ئەمان ودڵنیایی پێدەدات لە هەموو شتێك. کێش لە خوا نەترسێت لە هەموو شتێك دەیترسێنێت.

قەزای خوا وایە لە ئەزەلەوە          ترس وتاوانی وەل یەك داناوە

## بیست وحەوتەمهەم: دڵ نەخۆش دەخات

لە سزاکانی تری تاوان: دڵ نەخۆش دەخات. نەخۆشی چۆن کاریگەرە لەسەر لاشە، تاوانیش ئاوهایە بۆ دڵ. واش نەزانی ئایەتی: «چاکەکاران لە نێو نیعمەتدان وخراپەکارانیش لە سزا». تەنها بۆ نیعمەتی بەهەشت وسزای دوارۆژە بە تەنها! نەخێر بەڵکو بۆ هەر سێ

قوناغەکە دونیا وبەرزەخ ودوارِۆژ. جا هەموو چاکەکارێك پێش بەهەشتەکەی دوارِۆژ، ئەبێت برِواتە نێو بەهەشتەکەی دونیاوە.

بۆیە ئەبو سولەیمانی مەغریبی ئەیفەرموو: ئەگەر بەهەشتیان لە حالێکی وا خۆشدا بن کە من تێیدام، ئەوە بەرِاستی لە حالێکی زۆر خۆشدان.

عەبدوڵای کورِی موبارەك ومالکی کورِی دیناریش لێیانەوە هاتووە فەرمویانە: «خەڵکی دوونیا هەژارن دونیایان جێهێشت کەچی خۆشترین شتیان تێدا نەچەشت».

ئیبراهیمی کورِی ئەدهەمیش ئەیفەرموو: ئەگەر شا وشازادەکان بیانزانیایە لە چ حالێکی خۆشداین ئەوا بە شمشێر لەسەری شەرِیان لەگەڵ دەکردین.

ئیبن تەیمیەش ئەیفەرموو: لە دونیادا بەهەشتێك هەیە هەرکەس نەرِواتە ناویەوە ئەوا لە دوارِۆژیشدا نارِواتە ناویەوە.

## بیست وهەشتهەم: نەفسی تاوانکار بچوك دەکاتەوە تا ئەیکاتە بچوکترین شت

جا چۆن تاعەت پاك وگەورەی دەکاتەوە وگەشەی پێدەدات. تاوانیش ئاوها بەڵام بە پێچەوانەوە.

## بیست ونۆهەم: خاوەنەکەی دەکاتە دیلی شەیتان

سا توخخوا کامتـــان ڕازی دەبـــن بـــبن بـــە دیلـــی مرۆڤێـــك چ جـــای شـــەیتانی دوژمـــنی سەرســـەختان؟! کـــۆت وبەنـــدتان بکـــات ولـــە بەندیخانەیەك دا بتبەستێتەوە!

بنەڕەتی ئەمەش یەك شتە: بەندە تا لە خواوە دوورتر بێت ئافـات زووتر کاری تێدەکات ودەیبات، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە.

## سیهەم: تاوان کەسایەتی وپایە وپلە وڕێزی کەسەکە دەخات

هـــەم لای خـــوا وهـــەم لای خـــەڵکیش. جـــا بـــەڕێزترین لای خـــوا تەقواکارترینە جا تا تاعەتی زیاتر لای خوا پلە وپایەدارترە، کە تاوان وسەرپێچیشی کرد لە پێش چاوی خـوا دەکـەوێت ولـە پـێش چـاوی خەڵکیشی دەخات.

## سی ویەکهەمین: ناوە بەڕێزەکانی لێدادەماڵێ وناوی نابەڕێزی بە بەردا دەکات

لە سزاکانی تری تاوان: ناوە بەڕێز وشـــەرەفمەند وشـــکۆدارەکان لـــە خاوەنەکەی دادەماڵێت وناوی خراپ وبچوك وبێڕێزی بە بەردا دەکات. جا ناوی ئیماندار وپیاو چاك وچاکەکار وتەقواکار وگوێڕایەڵ وگـەڕاوە ووەلی ودونیا نەویست وچاکەخواز وخواناس وخواپەرست ولە خوا ترس وهاوشـێوەکانیانی لـێ دادەماڵێـت، ونـاوی پیـاو خـراپ وخراپـەکار وسەرپێچیکار وگەندەڵ وپیس وخوا غـەزەب لێگرتوو، وشـەڕواڵ پـیس

ودز وپیـــاو کـــوڕ ودرۆزن وخیانـــەتکار وناپـــاك ونێربـــاز وغـــەدرکار وهاوشێوەکانیانی بەبەریدا دەکات.

### سی ودووهەمین: ئەبێتە مایەی پچڕانی پەیوەندی نێوان بەندە وخوا

که پچڕانیش دروست بوو هۆکارەکـانی خێـر وخۆشـی لێـدەبڕیت، وهەرچی هۆکاری خراپە وشەڕە دێـت بـە سـەریدا. ئـیتر چـاوەڕێی چ خێرێکی، له کەسێك، هۆکارەکـانی خێـری لێپچـڕا بێـت وپەیوەنـدی نێوان ئەو ودۆستەکەی پچڕا بیت؟! کە بۆ چاو تروکاندنێك لێی بێنیـاز نیه وهەمیشه پێویستی پێیەتی! لەبەرامبەردا پەیوەنـدی نێـوان ئـەو ودوژمنەکەی توند بوو بێت؟!

### سی وسێهەمین: بەرەکەتی تەمەن ورۆزی وزانست وکار وتاعەت ناهێڵێت

وله گەورەترین سزاکانی تری تاوان: ئەوەیه پیت وقوت وبەرەکـەتی تەمەن ورۆزی وزانست وکار وتاعەت ناهێڵێت.

ئەی نەتبیستووە: کەسی وایە دوو ملیۆن دیناری عێراقی یان زیاتر یان تۆزێ کەمتر موچەکەیەتی، هەر ئەگری وئەڵێ بەشم ناکات.

هەشە مانگانەکەی ٤٠٠ یـان ٥٠٠ هـەزار دینـارە خێریشـی لـێ دەکات.

## سی وچوارهەمین: ئەوەی پێشتر پێی نەدەوێرا ئێستا پێی دەوێرێ

وله سزاکانی تری تاوان: ئەوەی پێشتر جورئەتی نەکردۆتە سەری، دوای تاوانکردن پێی دەوێرن.

## سی وپێنجهەمین: له کاتی ئەوپەڕی پێویستیدا تاوانەکان خیانەتی لێدەکەن

وله سزاکانی تری تاوان: کاتێك بەندە ئەوپەڕی پێویستی هەیە بە خۆی تاوانەکان خیانەتی لێ دەکەن وپشتی بەر دەدەن وناچنە هانایەوە. وەك شمشێرێك ژەنگ گرتبێتی ونوسا بێت بە شمشێر دانەکەوە، کاتێك خاوەنەکەی دەیکێشێت بە دەستیەوە نایەت، جا دوژمنێکی ڕێی پێدەگرێت وئەمیش شمشێرەکەی دەکێشێت هەرچی دەکات سوودی نیە تا ئەم لە هەوڵدانە ئەو پەلاماری دەدات وزەفەری پێدەبات.

## سی وشەشهەمین: دڵ کوێر دەکات

وله سزاکانی تری تاوان: دڵ کوێر دەکات، ئەگەریش نەگەیشتە ئەو ڕادەیە ئەوا بێگومان بینایی (بصیرە)تی دڵ لاواز دەکات. دڵ کوێر دەکات کە دڵ کوێر بوو تەوحید وعەقیدەش لاواز ئەکات.

## سی وحەوتهەمین: یارمەتیدانێکە پێشکەشی شەیتانی دەکات لەدژی خۆی

تاوانکردن یارمەتیدانێکە، مرۆڤ پێشکەشی شەیتانی دوژمنی خۆی دەکات لەدژی خۆی. چونکە خوای گەورە دوژمنێکی بۆ ئەم

مرۆڤە داناوە لێی جودا نابێتەوە بۆ چاوتروکاندنێك، دەخەوێت بەڵام ئەو ناخەوێت، بێئاگا ئەبێت بەڵام ئەو بێئاگا نابێت. ئەو ئەم دەبینێت بەڵام ئەم ئەو نابینێت. هەمو هەوڵێکی خۆی دەدات بۆ دژایەتیکردنی ئەم. وپشتیش دەبەستێت بە هاوکارەکانی خۆی لە جنۆکە ومرۆڤە شەیتانیەکان

**سی وهەشتهەمین: تاوان کردن بەندە لە بیری خۆی دەباتەوە**

ولە سزاکانی تری تاوان: بەندە لە بیری خۆی دەباتەوە، جا کە خۆی لە بیر کرد، ئەوسا ئیهمالی دەکات وخراپی دەکات وسەر لە لەناچوونەوە دەردەکات. بەرژەوەندیەکانی خۆی لەبیر دەچێتەوە وتەنانەت بە مێشکیشیدا نایەت. هەروەها نەخۆشیەکانی دڵی خۆی لە بیر دەباتەوە. ڕێگاکانی کامەرانی وسەرفرازی خۆی لەبیر دەباتەوە.

**سی ونۆهەمین: دووری دەخاتەوە لە فریشتە هاوەڵەکەی**

لە سزاکانی تری تاوان: وەك چۆن لە خوا دووری خستەوە، ئاوهاش بەندە دوور دەخاتەوە لە دۆست وبە سوودترین ودڵسۆزترین کەس بۆی، کە فریشتە هاوەڵەکەیەتی، کە کامەرانی بەندە لە نزیك بوونەوەیەتی لەوەوە.

**بە کورتی، ئەمانە زیانەکانی تاوانە:**

١. مەحروم بوون لە زانستی شەرعی.

٢. مەحروم بوون لە ڕزق و ڕۆزی و کار و کەسابەت.

٣. نەمانی بەرەکەت. بەرەکەتی رزق و رِۆزی، بەرەکـەتی زانسـت، بەرەکەتی تەمەن.. هتد.

٤. بەر لەعنەتکەوتنی لە لایەن ئاژەڵانەوە.

٥. ئەو دڵتەنگی و بێ تاقەتیەی کە سەر دڵی دادەگرێت چ لە نێوان خۆیی و خەڵك بێت؟ یان لە نێوان خۆیی و خوای مەزن.

٦. رِەشبوونی دڵ.

٧. تاریکی دڵ.

٨. تەسکی و تەنگی دڵ.

٩. خەمباری دڵ.

١٠. ئێش و ئازاری دڵ.

١١. دڵەراوکێ.

١٢. گرانبوونی کار و بارەکان لەسەری.

١٣. رِەش هەڵگەرِانی دەم و چاو.

١٤. مەحروم بوون لە تاعەت و عیبـادەت، کـە پێئەچـێت بـەهۆی تاوانێکەوە، دەیان کاری خێرت لە دەست بچێت، هەروەك چۆن بەهۆی تاوانێکەوە کار و کەسابەت و خێرێکی زۆرت لەدەست دەردەچێت.

١٥. تەمەن کورتی.

١٦. کەم سەرکەوتن، کەمجار سەرکەوتو دەبێت لە کارو بارەکانیدا.

١٧. گیرانەبونی دوعا.

١٨. نەمانی بەخششی خوایی و ناز و نیعمەت.

١٩. نقوم بون لە توڕەیی خەشم و نیقمەت.

٢٠. لە شومی و غەڕی تاوان ئەوەیە: تـاوانی تـر بـە دوای خۆیـدا دێنێت.

٢١. کزبونەوەی چرای تەوبە.

٢٢. ڕاهاتن لەسەر تاوانکردن.

٢٣. غیرەت لە دڵدا کـز دەکـات تـا وای لێـدەکات بـە تـەواوەتی دەیمرێنێت.

٢٤. شەرم و حەیا لە ئینساندا کز دەکات تا وای لێدەکات دەبێتـە پێشەوا لە بێشەرمی و بێحەیاییدا.

٢٥. تاوانکردن وا دەکات پەروەردگار بـە کـەم و سـوك تەماشـای بکات -خوای مەزن پەنا بدات-.

٢٦. گەورە ڕاگرتنی پەروەردگاری پایەبەرز لە دڵدا لاواز دەکات.

٢٧. بەردەوام بوون لەسـەر تـاوان کـردن وا دەکـات خـوای مـەزن سبحانە وتعالی بەندەکەی لەبیر بکات و بیداتە دەستی نەفسی خـۆیی و شەیتانەوە، -پەنا بە پەروەردگاری مەزن-.

٢٨. لە زیانەکانی تـاوانکردن ئەوەیـە: زەرەرەکـەی هەنـدێك جـار سەردەکێشێ بۆ دەوروبەر.

٢٩. لاوازکردنی بیر و هۆش و عەقڵ.

٣٠. مۆردانە سەر دڵ.

٣١. ترس و بیم دڵ دادەگرێت، ئـەو ئـەمان و دڵنیاییـەی ئەوسـای نامێنێت.

٣٢. تاوانکردن مرۆڤ بێ ڕێز دەکـات دوای ئـەوەی بـەڕێز و شـکۆ بووە.

٣٣. ئاخر شەڕی.

٣٤. سزای دوارۆژ.

٣٥. دوای ئـەوەی بەنـدەی خـوا بـووە دەبێتـە بەنـدەی هـەزارەها شەیتانی مرۆیی و جنۆکەیی، هەزارەها هەوا و ئارەزوی بێکەڵك.

٣٦. هەروەها لە زیانـەکانی تـری تـاوانکردن: لـە دەستچـونی بـە نرخترین و گرانترین و بە بەهاترین شت کە ئەویش بریتیە لـە: کـات، کە هەرگیز و بە هیچ شتێك تەعویز ناکرێتەوە و بۆی ناگەڕێتەوە.

بە کورتتر: زیانە پیسەکانی تاوان کردن لـەوە زۆرتـرن کـە کـورت هـەڵبهێنرێن و حەصـر بکـرێن. هـەروەکو چـۆن سـودە چـاکەکانی گوێڕایەڵی و پەرستش کردن لەوە زۆرتـرن کـە کـورت هـەڵبهێنرێن و حەصر بکرێن.

واتە: هەر چی خێری دونیا و ئاخیرەت هەیە لە تاعەت و عیبادەت کردندایە، هەرچی شەڕ و خراپەی دونیا و ئاخیرەتیشدایە لـە تـاوان و سەرپێچی کردنی خوادایە.

## شەشەم: زۆر بیر بکەرەوە لە بەهەشت و دۆزەخ

بیری گەورەیی بەهەشت و ئەو ناز و نیعمەتەی بهێنەوە کە خوای بەخشندە ئامادەی کردووە بۆ گوێڕایەڵی کاران، هەروەها بیری جەهەننەم و ئەو سزا و ئێش و ئازارانەی بهێنەوە کە تێیدا ئامادە کراوە بۆ سەرپێچی کەران. ئاوها هەمیشە لە نێوان ئومێد و ترسدا بژی تا خوای پەروەردگار لە بەهەشتەکەی خۆی بەهرەمەندت دەکات.

بە ئەحمەدیان ووت: کەی بیرمان ساف دەبێت وخەممان نامێنێت؟ وتی: لەگەڵ یەکەم هەنگاو خستمانە ناو بەهەشت!

## حەوتەم: خۆت سەرقاڵ بکە بە کارێکی سوود بەخش و لە تەنیایی و دەست بەتاڵی دوور بکەوە:

چونکە نەفس ئەگەر سەرقاڵی نەکەی بە گوێڕایەڵیەوە سەرقاڵت دەکات بە سەرپێچیەوە، مەشغوڵی نەکەیت بە هەق مەشغوڵت دەکات بە بەتڵەوە.

بەتاڵی و بێ کاری سەر دەکێشێ بۆ هەڵدێر و لە ڕێ لادان و مودمین بوون، هەروەها سەر دەکێشێت بۆ هاوڕێیەتی کردنی خەڵکانی بێ کەڵك و خراپ. هەر لە کۆنیشەوە وتراوە: کات وەکو شمشێر وایە گەر نەیبڕیت دەتبڕێت.

## هەشتەم: بە گوێی هەوا و ئارەزوت مەکە:

هیچ شتێك نیە بە ئەندازەی هەوا و ئـارەزوو مەترسـیان بـۆ سـەر مرۆڤ هەبێت. بەڵێ! هیچ شتێك نیـە بـە ئەنـدازەی هـەوا و ئـارەزوو مەترسیان بۆ سەر مرۆڤ هەبێت. هەر بۆیە دەبینیت خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ [الفرقان:٤٣]، جـا هەركەسـێك دەیەوێ تەوبەیەكی پاك وبێ خەوش بكات، دەبێـت خـۆی لـە شـوێن كەوتنی هەوا و ئارەزو دارنێت، ئەبێت پێ بـە پێـی شـەرع هـەنگا و بنێت. ئەڵێن: بۆیە بە هەوا و ئارەزو وتراوە: هەوا، چونكە خاوەنەكەی هەوا ئەداتە نێو دۆزەخەوە -خوا پەنا بدات-.

## نۆیەم: دوعا كردن

ئەمەشیان لە بەسودترین هۆكارەكـان و ئاسـانترین دەرمانەكانـە، دوعـا كـردن دوژمـنی بـەڵا و موصـیبەتە، بـەرەنگاری دەبێتـەوە، چارەسەری دەكات، سوكی دەكاتەوە، نایهێڵێت.

هەمیشە دوعا بكە خـوای مـەزن تەوبەیـەكی نەصـوح و سـاغ و ڕاستەقینەت پێ ببەخشێت.

هەر چی پەیامبەرە عَلَيْهِمُ ٱلسَّلَامُ دوعای كردوە خوا تەوبەی لێ قبـوڵ بكات، ئەوە دووەم گەورەی پەیامبەران ئیبراهیم عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ

دەفــــەرمویّت: ﴿ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٨ ﴾ [البقرة:١٢٨].

ئــەوەش ســەرداری هــەموویان موحەممــەدە عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ دەفەرمویّت: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وتُبْ عَليَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَابُ الرَّحِيم».

بەڵکو زیکری سەرجەم بەندە ساڵحەکانی خوای مەزن بــریتی بــووە لە: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦ ﴾[آل عمران:١٦].

بەڕاستی هەقە لەسەر ئەو کەسەی ئەیەویّت بەڕاستی تەوبە بکــات و بگەڕێتەوە، دوعا زۆر بکات و زۆر بپاڕێتەوە کە خوای تەوبە وەرگر لێی خۆش بێت و تەوبەکەی لیّ وەربگریّت، بە دوای ئەو کات و سات و حاڵەتانەدا بگەڕێت کە ئومێدی وەڵامدانەوەی دوعای تیّدا دەکریّت.

وەکو دوعا کردن لە کۆتایی شەو و کاتی سەحەر، لە سوجدەدا، لە نێوان بانگ و قامەتدا و...هتد.

ئیبن ئەلجــەوزی دەڵێــت: «ئــەی تاوانبــار! لەبــەر دەرگــای غــەففار ڕاوەستە، ئەو کاتەی هەمووی نوستە، بە زمانی پۆزشەوە بیڵیّ ئەوەی لە هەستتە(١)، سەرت داخە، دوعا لە دوای دوعا بکە، درێــژی بکــە، قەیناکا، بڵیّ: ئــەی پەروەردگارەکــەم! ئــەی بیســەر و بینــای چــون و

---

(١) کە لە هەستت دایە، لە ناخت دایە.

هاتنەکەم! لە هەژاری و نەداری زیاترم نیە پێی لــە دەرگــات دەم! تــا داوای ناز و بەخششی تۆی پیّ بکەم؟ شەرمەزاری بەر دەرگاتم...».

کەواتە: بپاڕێوە وبکڕوزێــوە لــەو خوایــەی کــە دڵــەکان لــە نێــوان پەنجەکانی ئەودایە، وکارەکان هەمووی لە دەستی ئەودایە، وهەمیشە ئەو بڕیار لە شتەکان دەدات. بەشــکو نزاکــانی بــەر کــاتی دابــەزینی بەزەیی خوا کەوت، بەر ساتی گیرا بوونی دوعا کەوت، بەر ئەو وەختە کەوت کە داوای هەرچی لە خوا بکرێت دەیبەخشێت، جا هــەر کــەس خوا سەرکەوتووی کرد بۆ دوعا پێشی دەبەخشێت وەك ئەڵێن: خوایــە! ئەگــەر ویســتی پێبەخشــینت نەبوایــە پــێم، داوات نــەدەکر لێــت بپارێمەوە.

جا بێتاقەت نەبی لە درەنگ گەیشتن، جاری وا هەیە خوا بێبەشــت ناکات مەگەر بۆ ئەوەی پێت ببەخشێت، نەخۆشت ناکات مەگــەر بــۆ ئەوە شیفات بدات، هەژارت ناخات مەگەر بــۆ ئــەوەی دەوڵەمەنــدت بکات، ناتمرێنێت مەگەر بۆ ئەوەی زیندووت بکاتــەوە، لــە بەهەشــت باوکمــانی دەرنــەکردووە مەگــەر بــۆ ئــەوەی هــەمووما پێکــەوە بگەڕێنێتەوە.

لە ئەسەرێکدا هاتووە: «خوای گــەورە لــە ڕۆژەکانیــدا نەفــەحات وڕەحمەتی هەیە جا خۆتان بدەنە بەر نەفەحاتی خوا»، سا خۆتان بدەنە بەر بای ڕەحمەتی خوا.

جا لەوانەیە ساتێك لەو ساتانەی خۆت لە تاوان دوور دەخەیتەوە بەر ڕەحمەتی خوای میهرەبان بکەویت، یان ساتێك بێت لەو ساتانەی کە دووعای تێدا گیرایە. بپاڕێیتەوە وبڵێی: خوایە لەبەر تۆ تاوان ناکەم، خوای گەورەش لەبەر ئەو ڕستەیە وەڵامت بداتەوە وبۆ هەتا هەتایە کامەرانت بکات. ئەی خۆزگە بەو بەندەی خوای گەورە کامەرانی بۆ دەنوسێت بۆ هەتا هەتایە.

## دەیەم: گەورەیی ومەزنی خوا ﷻ لەگەڵ خۆشویستنی

جا هەر کەس ئەم گەورەییەی خوای لە دڵدا بێت، وبیبینێت وئاگاداری بێت، هەرگیز دڵی بەرایی نادات تاوان بکات، بۆیە ڕێی تەوبە کردن دەگرێتە بەر. ئەمەش بەوە دەبێت موسڵمان ئاگای لە جەلالەت ومەزنی وگەورەیی خوا بێت لە دڵیدا، کە خوا بینەرە ودەیبینێت، بیستەرە ئەیبیستێت. وەك پەروەردگار ئەفەرموێت: {مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا * وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا} [نوح:١٣-١٤]. ((ئەوە چیتانە بۆ خوا بە گەورە ڕاناگرن وقەدری ناگرن وەك شیاوی ویە؟!)).

خەڵكیش کاتێك قەدری خوای گەورەیان گرت ئەگەڕێنەوە بۆلای، کەییش خوایان لا گەورە نەبوو، ئەوسا ناگەڕێنەوە لای وسەرپێچی دەکەن.

بیشری کوڕی حارسی حافی ئەفەرموێ: ((ئەگەر خەڵك بیریان بکردایەتەوە لە گەورەیی خوا سەرپێچیان نەدەکرد)).

هەروەها ئەوەی وا دەكات تەوبە بكەیت ولە تاوانــەوە دوور بیــت: بریتیە لە: خۆشویستنی خوای میهرەبــان. كــە خواشــی خۆشەویســت ئەوســا واز لـــە تـــاوان دێنێــت لەبـــەر خۆشەویســـتی وی. چـــونكە خۆشەویســت گوێڕایـــەڵی خۆشەویســتە. جـــا باشـــترین وازلێهێنـــان، وازلێهێنانی خۆشەویستانە، وەك چۆن چاكترین گوێڕایەڵی، گوێڕایـــەڵی خۆشەویستانە، جا جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان وازهێنان وگوێڕایـــەڵی خۆشەویست لەگەڵ وازهێنان وگوێڕایەڵی كەسێك لە ترسی سزای بێت.

سەرپێچی دەكەی وئەشـڵێی خۆشـمەوێ ❊ ئەمە مەحاڵە وقـەت شـت وا نـابێ

ڕاسـتگۆ ببوایـەی گوێـــڕایەڵ دەبـووی ❊ لەقسەی دۆستەكەت وەدەرنەدەچووی

## یانزەهەم: نیعمەت وفەزڵ وچاكیەكانی خوا ﷻ

بیر كردنەوە لەو هەموو نیعمەتانەی خوای گەورە كــە ڕژاندویـــەتی بەسەرتدا، وا دەكات دوور بیت لە تاوان. چونكە كەسی بـــەڕێز خراپـــە ناكات لەگەڵ كەسێكدا كە چاكەی لەگەڵدا كـردووە، كەسـی نامـــەرد وناڕەسەن وادەكات.

ئەی بەندەی خوا! ئەتوانی ئەو نیعمەتانەی خوا بژمێری كە هەیەتی بەسەرتەوە؟! جا با شەرمی خوا بتگرێت خێر وفەزڵ وچاكە ونیعمـــەتی وستر وداپۆشینی خوات بۆ دابەزێت ولە بەرامبەردا تاوان وسەرپێچی وتۆ بۆ ئەو خوا نیعمەت بەخشە چاكەكارە بەرز ببێتەوە. فریشـــتەیەك

ئەوە دابەزێنێت بۆ تۆ، وفریشتەیەکیش ئەمە بەرز بکاتەوە لە تۆوە بۆ خوا، بەڕاستی وەڵامدانەوەیەکی زۆر ناشیرین ونا لایقە.

## دوانزەهەم: تووڕە بوون و تۆڵە کردنەوەی خوا ﷻ

ئاگات لە تۆڵە و توڕەیی خوای مەزن بێت. کە بەندە ڕۆچوو لە تاواندا پەروەردگار تووڕە ئەبێت، کە توڕەش بێت هیچ بەرگەی توڕەیی وی ناگرێت چ جای بەندەیەکی لاوازی بێدەسەڵات وئاتاج. جا کەس هەیە بەرگەی توڕەیی خوا بگرێت؟! نا بەخوا.

پەروەردگاریش مۆڵەتی ستەمکار دەدات تا ئەوکاتەی ئەوەندە ڕۆ ئەچێت لە تاوان ولێی دەگرێت وسزایدا، کە سزایدا ئیتر لە دەستی خوا قوتاری نابێت. بە.

## دوانزەهەم: ئەو شتانەی بەهۆی تەوبە نەکردنەوە لە دەستی دەچێت

واتە: ئاگات لەوە بێت بە سەرپێچی کردن چی لە دەستت دەچێت" لە نیعمەت وخێر وچێژ وخۆشیەکانی دونیا ودواڕۆژ. لەگەڵ لە دەست چوونی ناوە جوان وچاك وخێر وباشەکان، وبە بەردا بڕانی ناوە خراپەکان. لە هەموویشی کاریگەرتر: ئاگا بوونە لە نەمانی ئیمان کە مسقاڵە گەردێکی لە هەموو دونیا وئەوەشی تێیدایە باشترە، ئیتر چۆن دەیفرۆشیتەوە بە حەز وئارەزوویەکی چەند ساتی، کە تامەکەی

دەڕوات، بەڵام خەفەت وئازار وناڕەحەتیەکانی بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە. پەیامبەری خوا ﷺ باسی شەڕواڵ پیس دەکات دەفەرموێت[1]: «لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً، يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ، حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ». «زیناکار ئەو کاتەی زینا دەکات ئیماندار نیە، مەیخۆریش کاتێك مەیەکە دەخوات ئیماندار نیە، دزیش کاتێك دزی دەکات ئیماندار نیە. وتاڵانکەر کاتێك بە ئاشکرا تاڵانی دەکات ئیمانی نیە». جا: «ئیمانەکەی لەسەر سەری وەك سێبەر ڕادەوەستێت، ئەگەر تەوبەی کرد ئیمانەکەی بۆ دەگەڕێتەوە».

## سیانزەهەم: تام و چێژی ناچار کردنی نەفس و شەیتان

لەو شتانەی تر کە بەرەو تەوبە کردن دەتبات و لە تاوان کردن دوورت دەخەنەوە، بریتیە لە: بەزاندن وزەفەر پێبردنی شەیتان ونەفس هێنانە پێش چاووی خۆ. جا دەم کوت کردنی ئارەزوو وزەفەربردن بە شەیتان تام وچێژ وخۆشیەکی تایبەتی هەیە، کە زۆر خۆشتر وبە چێژترە وەك لە زەفەربردن بە ئادەمیە دووژمنەکانت. سەرچاوەی تاوان کردن شەیتان ونەفسە. جا تاوان نەکردنت بریتیە لە لوت شکاندنیان

(١) متفق عليه: أخرجه البخاري (٢٤٧٥،...)، ومسلم (٥٧).

وزاڵ بوون بە سەریاندا. پەیامبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت[1]: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُنْضِي شَيَاطِينَهُ كَمَا يُنْضِي أَحَدُكُمْ بَعِيرَهُ فِي السَّفَرِ» «ئیماندار شەیتانەکەی لاواز ولەڕ وبێ هێز ئەکات، وەك چۆن ئێوە لەسەفەردا وشترەکەتان بێ هێز دەکەن»...

سا ئەی تۆبەکار! ئەی موسڵمان! بیر لەوە بکەرەوە کە تاوان ناکەیت زەفەر بەشەیتان ئەبەیت ولێی ئەبەیتەوە.

## چواردەهەم: بردنەوەی قەرەبووی خوایی ﷻ

سەیری ئەوە بکە کە ئەگەر تەوبە بکەیت و خۆت لە تاوان بپارێزیت، چیت بۆ هەیە لە بەرامبەردا؟ تەعویزەکەی چیە؟ قەرەبووی واز هێنان لە حەرامەکان وکپ کردنەوەی نەفس چیە؟ قەرەبووەکەی بریتیە لەو شتانەی خوا بەڵێنی بە موسڵمان داوە لە دونیا ودوارۆژدا. ئەوسا بەراورد بکە لە نێوان ئەمە، لەگەڵ ئەوەی بەڵێنت پێدراوە، بزانە تەنانەت لە بەراوردیش دێت؟!

## پانزەهەم: ترسان لە لە پڕ هاتنی ئەجەل

ئاگات لە پڕ مردن بێت: واتە: بترسێت لە پڕدا ئەجەلی بێت وبمرێت وئەوسا خۆشیەکانی دوارۆژی لە دەست دەچێت، ئای چەند خەفەتی هەیە ئەو لە پڕا مردنە. هەموو کەسێکیش ئەجەلێکی هەیە ودیاری

---

[1] أخرجه أحمد في «المسند» (9062). انظر: «الصحيحة» (٣٥٨٦). أيْ: يُهْزِلُهُ وَيَجْعَلُهُ نِضْوًا. وَالنِّضْوُ: الدَّابَّةُ الَّتِي أَهْزَلَتْهَا الْأَسْفَارُ وَأَذْهَبَتْ لَحْمَهَا.

کراوە، وپاش وپێش خستنی بۆ نیــە. وئێوارەشــت کــردەوە چــاوەڕێی بەیانی مەکە.

ئەی تاوانکار بیرت لەوە کردۆتەوە: کێ زەمانەتت دەکات نــەمریت وتەمەنت درێژ بێت تا تەوبە دەکەیت. دونیا کورتە، بڵێ: ئەی نــەفس سەبر بگرە بەیانی لەگەڵ حۆریەکاندا لە بەهەشت شاد دەبیتــەوە، خــۆ ڕاگر ببە دیداری خوای گەورە نزیکە. {فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} [الكهف: ١١٠]، «کێ ئەیــەوێ بگاتەوە لقائی خوا با کردەوەی چاك بکات، ئەوە دیداری خــوای باڵــا نزیکە».

## شانزەیەم: بزانە چی بەڵای هەقیقی وچیش بێوەیی ڕاستەقینەیە؟

بەڕاستی بەڵای هــەقیقی وڕاســتەقینە نیــە مەگــەر لــە تاوانــەکان وسەرەنجامەکانی نــەبێت، وبێــوەیی تــەواوەتیش بریتیــە لــە تاعــەت وسەرەنجامەکانی. واتە: ئەگەر واز لە تاوانەکان بهێنیت توشی بێوەیی دێیت، ئەگەریش دەست بۆ تاوان بەری توشی بەڵا دێیت.

سەلەف ئەڵێن: «خوای گەورە لە قورئانــدا دەرد ودەرمانەکــەی بــۆ دیاری کردون، دەردەکەتان تاوانە ودەرمانەکەشتان تەوبە وئیســتیغفار کردن وگەڕانەوەیە بۆ لای خوای میهرەبان». جا دەرد وبەڵا بریتیە لــە

دەست بردن بۆ تاوان. هــەروەها: «بەنــدە بــەهۆی تاوانەکەیــەوە لــەو ڕۆزیەی بۆی دانراوە بێبەش دەبێت». ڕۆزیەکــەی بــۆ نوســراوە، بــەڵام ئەگەر تاوانی کرد ئەو ڕۆزیەی لێ دەبڕدرێــت، بــەهۆی تاوانــەوە لێــی بێبەش دەبێت. هەروەها بەهۆی تاوانەوە تەمەن کورت دەبێتەوە.

## حەڤدەهەم: ڕێگە نەدان بە ختورە خراپەکانی نەفس

واز هێنان لە ختورەی نەفس. ڕێگا نەدەیت بیر وخــەیاڵت بــڕوا بــۆ تاوان، مەهێڵە بیرۆکەی خراپ نیشتەجێ ببێــت لــە مێشــکتدا، هــەر ئەوەندە بیرت پێدا، شوێنێك بۆ خۆی تەرخان دەكات وداگیری دەكات. كە شوێنێكی داگیركرد دەرئەنجامەكەی ئەبێتە كردەوە وتاوانەكە ئــەنجام دەدەیت چونكە مێشكی تۆی داگیر كردووە.

ئەمــەش خــاڵێكی زۆر زۆر گرنگــە ولــە ناميلكــەی یەكــەمیش دیسانەوە ئاماژەی بۆ كــرا، ئــەویش ئەوەیــە: هــەمــوو تاوانێــك لــە بیركردنەوەوە دروست دەبێت.

كاتێك بە بیرتدا دێت پەیوەندی لەگەڵ فلان ئافرەت ببەســتی، یــان لەگەڵ فلان كوڕ ببەستی وئەم خەیاڵ وختــورە پــاڵ نانێیــت ودەهێڵــی شوێنی خۆی لە مێشــكتدا بكاتــەوە، ســەرئەنجامەكەی ئــەو هــەزارەها پەیوەندیە ناشەرعیەیە كە دروست بووە ودروست ئەبێت.

برام، خوشکم! کاتێـك خراپـە دێـت بـە مێشـکتدا، بیـبڕە -خـوا موەفقت بکات-، ئەگەر نەتبڕی وئەویش کەندڕی کرد، ئـەبێت بـاجی ئەو چاڵە بدەیت. چونکە ئاواتەکان دەبن بە کردەوە ئەگەر بڕەخسێن.

## هەژدەهەم: دونیا بێنرخ وفانیە وخێرا تەواو دەبێت

بیرکردنەوە لە بێ قەدر ونرخـی دونیـا، کـە خێـرا تـەواو دەبێـت. ئەمەش زۆر بەسودە، بەندە بیری لێ بکاتەوە وای لـێ دەکـات تەوبـە بکات و لە تاوانەوە دوور بێت وباوەڕی قایم بێت.

ئەی ئـەوەی خۆشەویسـتی دونیـا وای لێکردوویـت لێـوت گـەورە دەکەیتەوە، ولووتت بچوك دەکەیتەوە، بیر لەوە بکەوە دونیـا کورتـە وبەیانی خۆڵ ئـەیخوات، لەوانەیـە بـەیانی تووشـی ڕووداوێـك ببیـت وبمریت، یا لەوانەیە لە ژێر دەستی پزیشکەکە هەر هەڵنەستیتەوە.

ئەی گەنج کە بە داوی ناموسی خەڵکەوەی تـا کـەی؟ بـە تـەمای چەندێك بژیت؟

ئەی گەنج! ئەی پیاو! ئەی ژن! تا کەی سنورەکانی خوا دەبەزێنن؟! تا کەی خیانەت دەکەیت؟!

تا کەی ڕیبا خواردن؟! تا کەی بەرتیل خواردن؟! تا کەی ئازاردانی دایك وباوك؟!

دونیا بێ نرخە دونیا زوو تەواو دەبێـت.

جا مرۆڤ زانی دونیا کورتە، ڕازی نابێت کەمترین شتی دونیا وبێ کەڵکترینی لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ دوارۆژ، اللهم مەگەر کەسێکی بێ وورە ونەفس نزم ودۆڕاو وڕووخاو ودڵ مردوو

## نۆزدەهەم: خۆشی و سەر بەرزی ڕاستەقینە لە دوارۆژدایە

ئەبێ بەندە بزانێت کە خوا سبحانە بۆ مانەوەیەکی هەمیشەیی وا دروستی کردووە کە فەنای بۆ نیە، بۆ سەربەرزیەك سەرشۆڕی تێدا نیە، بۆ ئەمانێك ترسی تێکەڵ نیە، وبۆ بێ نیازیەك نیازمەندی تێدا نیە، وبۆ خۆشی وچێژێك کە ناخۆشی لەگەڵدا نیە. خوای گەورە دروستی کردوی تا بمێنیتەوە نەك فەنا بیت، جا تاوان لەناوت ئەبات وعومرت کورت دەکات ودوارۆژیشت باش نابێت لەگەڵیدا. خوای گەورە بۆ ئەوە دروستی کردویی تا بڕۆیتە بەهەشتەوە ولەوێدا شاد ببیتەوە، نەك بڕۆیتە دۆزەخەوە، باوکە ئادەمی نەخستە دۆزەخەوە خستیە بەهەشتەوە، دەریشی نەکرد مەگەر بۆ ئەوەی دووبارە بیگەڕێنێتەوە:

وەرن بۆ بەهەشتەکان * مەنزڵگای یەکەمجارمان

ئێمە دیلی دوژمنین * چاوەڕیی زێد خۆمانین

یانی: ئێستا دیلی شەیتانین ئەبێت خۆمانی لێ ڕزگار بکەین.

له بنەڕەتدا ئێمە خەڵکی سەر زەوی نین، ئێمە خەڵکی ئاسمانین، ئێمە خەڵکی بەهەشتین، خەڵکی بەهار وسەوزی وڕازاوەیین، هەر بۆیە دڵیشمان بۆ سەوزایی وبەهەشت وباخ وباخات ئەڕوات، بۆیە خوا بۆ ئەوە دروستی کردوین بۆ ئەوەی خۆش بژین، نەك خراپ بژین، خوا بۆ ئەوە دروستی کردوین بۆ ئەوەی کامەران بین نەك بەدبەخت بین، دروستی کردوین بۆ ئەوەی لە ئەماندا بین نەك لە ترسدا. دروستی کردوین تا سەر بەرز بین نەك سەر شۆر. دەوڵەمەند بین نەك هەژار، لە تام وچێژدا بین نەك لە ئێش وئازار. لە کەماڵ وتەواویدا بین نەك لە کەموکورتی ونوقسانیدا بین. ئەمەش بریتیە لە بەهەشت.

هەروەها لەو شتانەی تر کە یارمەتیدەرن بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە: هیوا کورت بوون، یادی قیامەت کردن، تێفکران لە قورئان، شەرم و حەیاکردن، بیرکردنەوە لە سودەکانی خراپەنەکردن، نەزەرنەکردن، ئاگاداریکردنی بیر و هۆش و ختورە، چونکە سەرەتای هەرچی تاوانێك هەیە ختورە و بیرلێکردنەوەیە... لەگەڵ چەندین هۆکاری تر کە یارمەتیدەرن بۆ تەوبە کردن و بەردەوام بوون لەسەری.

۞ ۞ ۞

# مەرجەکانی تەوبەکردن

**برای ئازیز و خوشکی بەڕێزم..**

تەوبە کردن کۆمەڵێك مەرجی هەیە ئەبێت تێیدا بە دی بێت وەگەرنا ئەو تەوبە کردنە بە تەوبە کردن وگەڕانەوە وپەشیمان بوونەوەی ڕاستەقینەیی هەژمار ناکرێت، جا بۆ ئەوەی تەوبەکەت لێ وەر بگیرێت سەرەتا ئەبێت ئەم سێ و چوار مەرجەی تێدا بێت:

**یەکەم: یەکسەر واز بهێنیت لە ئەو گوناهانەی تەوبەی لێدەکەیت:**

هیچ کەسێك وا نەزانێت تەوبەی کردووە و تەوبە کردنەکەی عەیبی نیە، لە هەمان کاتیشدا بەردەوامە لە تاوان کردن، بە دەم ئەڵێت: ئیستەغفیرولا، دەستی ئەڵێت: نە وەڵڵا!

بەڵام ئەگەر هاتوو تەوبەی کرد و بەڕاستی وازی لێ هێنا، سوریش بوو لەسەر ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێتەوە، هۆکارەکانیشی گرتە بەر بۆ دوور کەوتنەوە، بەڵام دوای ماوەیەك دیسانەوە گەڕایەوە بۆ ئەنجامدانەوەی، ئایا تەوبەکەی دروستە؟!

لێرەدا زانایان خیلافیان هەیە، ڕای سەنگین وپەسەندیش لە ئەم پرسەدا ئەوەیە: ئەگەر کەسێك تاوانێکی ئەنجامدا پاشان تەوبەیەکی ڕاستەقینەی لێ کرد، سوریش بوو لەسەر ئەوەی جارێکی دی نەگەڕێتەوە، هۆکاریشی گرتە بەر بۆ دوور کەوتنەوە...، بەڵام نەفس و

شـــەیتان و هـــەوا و ئـــارەزوو زاڵبـــوون بـــە ســـەریدا و جـــارێکی دی تاوانەکەیان پێ کردەوە؛ ئەوا تەوبە پێشووەکەی قەبوڵــە -إن شاء الله- و بەتاڵ نابێتەوە.

بەڵام بـۆ ئـەم تاوانـەی کـە دوا جـار ئـەنجامی داوەتـەوە ئـەبێت تەوبەیەکی تازە بکاتەوە -وەك چۆن لەوەو پێش تەوبەی کرد-، ئیتر ئا بەو شێوەیە کە دوای تـاوان گەڕایـەوە، دیسـانەوە تەوبـە دەکاتـەوە، ئەمەش خاڵێکی گرنگە و ئاگاداری ببە و دەسـتی پێـوە بگـرە و لـە فێڵی شەیتان بە دوور بکەوە.

## دووەم: پەشیمان بوونەوە لەو تاوانەی لێت وەشاوەتەوە و تەوبەت لێ کردوە

بەڕاستی چاوەڕێی تەوبە ناکرێت مەگەر لە کەسێك پەشیمان بێـت لە ئەوەی ئەنجامی داوە، دڵ تەنگ بێت بە ئەوەی لێـی وەشـاوەتەوە، خەم بار بێت بە ئەوەی نەفسی خەڵەتاندویەتی، شـەیتان زەفـەری پـێ بردووە، شوێنی هەوا و ئارەزووی کەوتووە.

هەر بۆیە کەسێك کە باسی تاوانە پێشوەکانی خۆی دەکات و فەخر و شانازی پێوە دەکات بە تۆبە کار و پەشیمان لە قەڵەم نادرێت، هـەر وەك پەیامبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموێ: «النَّدَمُ تَوْبَةٌ»[1]. «پەشیمان

---

(١) أخرجه ابن ماجه في «سننه» (٤٢٥٢)، وأحمد في «مسنده» (٣٦٣٨، ٤٠٩٣)، والطيالسي في «مسنده» (٣٨٠)، والحميدي في «مسنده» (١٠٥)، وابن أبي شيبة في «مصنفه» (٢٨٣٢٤).

بوونەوە بریتیە لە تەوبە کردن». هەروەها بە دایکە عائیشەی فەرموو: «يَا عَائِشَةُ إِنْ كُنْتِ أَلْممْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي الله وتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ التَّوْبَةَ مِنْ الذَّنْبِ النَّدَمُ وَالِاسْتِغْفَارُ»[1]. «ئەی عائیشە ئەگەر تاوانێکت توش هاتووە، داوای لێ خۆش بوون بکە لە خوا و تەوبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای، چونکە تەوبە کردن لە تاوان ئەوەیە: پەشیمان ببیتەوە و داوای لێ خۆش بوون بکەی».

## خوشك و برای سەنگینم...

خوای مەزن پێی خۆشە پەشیمانی و زەلیلی لە بەندەکەیدا ببینێت، هەر بۆیە کە تەوبەیەك دەکەیت پەشیمان بەرەوە و دان بە هەڵەی خۆتدا بنێ و بڵێ:

پەروەردگارا! ئەوەی لێم وەشایەوە لەبەر ئەوە نەبوو هەقی تۆ بەکەم بزانم، یان نکوڵی لە زانست و ئاگادار بوونی تۆ بکەم، یان بەڵێنەکانت بە کەم بزانم...

پەروەردگارا! تۆش زاناتری، ئەوەم لێ وەشایەوە نەفس و شەیتان و هەوا و ئارەزو زاڵبوون بە سەرمدا، بە تەمای لێ خۆشبونی تۆ، بە هیوای بەخشینی تۆ، بە گومانی خێر بردن بە تۆ، بە ئومێدی فەزڵ و

---

وحسنه الحافظ في «الفتح» (٧٥٠٧)، والألباني والأرناؤوط. وانظر: «علل الحديث» لابن أبي حاتم (٥/ ٥٢)، و«العلل الواردة» للدارقطني (٥/ ١٩٠)، و«الضعيفة» (٢/ ٨٣).

(١) أخرجه البخاري في «صحيحه» (٢٥٩٣)، ومسلم في «صحيحه» (٢٧٧٠).

کەرەمی تۆ، بە تەمای فراوانی و نیـانی و ڕەحمـەتی تـۆ، نەفسم بـە گەورەیی ڕەحمەتی تۆ فریوی دام، جوانی ستری تۆ بەسـەرمدا، لەگـەڵ ئەمانەشدا نەزانی خۆم یارمەتیدام بۆ ئەنجامدانی، بەڵام ئێسـتا دەزانم هەڵەم، هیچ ڕێگایەکیشم نیە پەنای بۆ ببەم جگە لە تۆ نەبێت...

ئەی خوایە! زوڵمم لە نەفسی خۆم کرد لێم خۆش ببە...

### سێیەم: سوور بوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ ئەو تاوانە

تەوبەی کەسێك قەبوڵ نیە کاتێك تەوبە بکـات، نیـەتی دوو بـارە گەڕانەوی هەبێت ئەگەر بۆی بلوێت، بەڵکو ئەگەر ئەیەوێت تەوبەکەی ڕاستەقینە بێت و خوا لێی وەری بگرێت:

سەرەتا پێویستە یەکسەر دەست بەرداری تاوان کردن ببێت، پاشان پەشیمان ببێتەوە لە ئەوەی ئەنجامی داوە، هـەروەها بڕیـار بـدات لـە داهاتوودا نەگەڕێتەوە بۆ تاوان کـردن و سـووریش بێـت لەسـەر ئـەم بڕیارەی.

### چوارەم: گەڕاندنەوەی مافەکان «الْمَظَالِم» بۆ خاوەکانیان

ئەو سێ مەرجەی پێشو پێویستە لە هەموو تەوبە کردنێکدا هەبن، بەڵام ئەمیان لە کاتێکدا دەبێت ئەگەر هاتوو تاوانەکە پەیوەنـدی بـە مافی ئادەمیزادەکانەوە هەبوو، ئەگـەر ئەیـەوێت تەوبەکـەی ڕاسـت و قبوڵ بێت ئەوە پێویستە لەسەری مافەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە، لەبـەر

فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە کە لە صەحیحی بوخاریدا هـاتوە، ئـەڵێ: پەیامبەری خوا عَلَيۡهِ‌وَعَلَىٰٓ‌اٰلِهِ‌ٱلصَّلَاةُ‌وَٱلسَّلَامُ فەرمویـەتی: «مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلِمَةٌ لِأَخِيهِ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهَا فَإِنَّهُ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُؤْخَذَ لِأَخِيهِ مِنْ حَسَنَاتِهِ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ أَخِيهِ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ»[1]. «هەرکەسێك زوڵمی لە کەسێك کردوە و مافی لەسەرە، گیانی بێت یان مادی..، با ئـەمڕۆ گـەردن ئـازایی لەسـەری بکـات، پـێش ئەوەی ڕۆژێك بێت نە دینار و نە دیرهەم سوودی پێ ناگەیـەنێت، جـا ئەگەر لەو ڕۆژەدا کردەوەی چاکەی هەبێت لێی دەبرێت بـە ئەنـدازەی مـافی خـاوەن مافەکـە، خـۆ ئەگـەریش چـاکەی نـەبێت لـە کـردەوە خراپەکانی کابرای خاوەن ماف هەڵ دەگیرێت و دەدرێت بە کۆڵ سـتەم کارەکەدا».

جگە لەم مەرجانەش هەنـدێك مـەرجی تـر هـەن کـە ئـەبێت لـە تەوبەکردنەکەدا هەبێت، لەوانە:

### أ- ساغ و بێخەوش بوون بۆ خوای پاك و بێ عەیب:

بەو پێیەی کـە هۆکـاری تەوبەکردنەکـە خۆشویسـتن و بـە گـەورە ڕاگرتنی خوا و بەتاما بوونی پاداشت و ترسان لە سزای خـوای گـەورە بێت. هەر بۆیـە دەبینیـت خـوای پـاك دەفـەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ

(١) أخرجه البخاري في «صحيحه» (٢٤٤٩، ٦٥٣٤).

وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ﴾ [النساء:١٤٦].

«شوێنی ئەو مونافیقانە خواری خوارەوەی دۆزەخە تەنها ئەوانەیان نەبێت کە: تەوبەی ڕاستەقینەیان کرد و ڕیابازیان گۆڕی بە ئیخلاص و کار و کردەوەیان چاك کرد و بۆ خوا سوڵحیان بە ڕوکەش و بە هەناو، دینداریان لە بۆ خوا ساغ و بێخەوش کردەوە، ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداراندا دەبن».

بە کورتی: ئەبێت مەبەستت تەنها و تەنها خوای پایەبەرز بێت و هیچ مەبەستێکی تر نەبێت لە تەوبەکردنەکە، بۆ نمونە: وازهێنانەکەی لە تاوانکردن، لەبەر ئەوە نەبێت کە توانای ئەنجامدانی نەماوە، یان توانای ئەوەی نەماوە جارێکی دی بگەڕێتەوە، یان لە ترسی قسەی خەڵك واز بهێنێت. بەو کەسە ناوترێت تەوبە کار کە لەبەر سومعەتی وازی لە تاوان کردن هێناوە، یان ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر ئەو تاوانە خاوەن کارەکە یان سەرۆك دائیرەکە لە کارەکەی دوری دەخاتەوە. هەڵبەت کارێکی خراپ ناکات لە ترسی خەڵك واز بهێنێت، بەڵام پاداشتی بۆ نیە، ئەجری ئیخلاصی بۆ نانوسرێت.

بەو کەسە ناوترێت تەوبە کار لەبەر ئەوەی بۆ تەندروستی خراپە، یان ئەگەر بەردەوام بێت لاوازی دەکات، هێزەکەی جارانی نامێنێت، بۆ نمونە: کەسێك واز لە شەڕواڵ پیسی بهێنێت لەبەر ئەوەی توشی

نەخۆشیە کوشندەکان نەبێت، یان ئەگەر بەردەوام بێت لاشە و زاکیرەی لاواز دەکات.

هەروەها بەو کەسە ناوترێت تەوبە کار کە وازی لە عارەق خواردنەوە، یان قومار، یان کارە خراپەکانی تر هێنا بێت، لەبەر ئەوەی مایە پوچ بووە و پارەی پێ نەماوە.

هەورەها بەو کەسە ناوترێت تەوبە کار کە توانای تاوان کردنی نەماوە لەبەر هۆکارێك کە لە ژێر دەسەلاتی ئەمدا نیە، وەکو درۆزنێك لاڵ ببێت، یان زینا کارێك توانای جوت بونی نەمێنێت، یان دزێك بە هۆی ڕوداوێکەوە دەستەکانی لە دەست بدات و ئیتر نەتوانێت دزی بکات... وهتد.

جا ئەوانەی لەبەر ئەم حاڵەتانە و هاو شێوەکانی واز لە تاوان کردن دەهێنن، هەمیشە حەزیان لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانەیە، ئەگەریش بۆیان بلوێت ئەنجامی دەدەن، کە بۆشیان دەست نادات داخی بۆ دەخۆن، تەمەنناى کردنی دەکەن.

**خوای مەزنیش بێ دەسەلاتی ئاواتە خوازی، وەك بکەری کارەکە حیساب کردوە.**

ئەوەتا پەیامبەری خوا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ دەفەرمویێت: -وەك لە حەدیسەکەی ئەبو کەبشەی ئەنماریدا هاتووە-: «إِنَّمَا الدُّنْيَا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ،

عَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالًا وَعِلْمًا، فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا، فَهَذَا بِأَفْضَلِ الْمَنَازِلِ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ عِلْمًا، وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالًا، فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ، يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالًا لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلَانٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالًا، وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْمًا، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ، لَا يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَلَا يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَلَا يَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا، فَهَذَا بِأَخْبَثِ الْمَنَازِلِ، وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللهُ مَالًا وَلَا عِلْمًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالًا لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلَانٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ»(١).

واتە: «حاڵی ئەهلی دونیا وەکو حاڵی ئەم چوار کەسە وایە:

١. کەسێك خوای باڵا دەست ماڵ و زانستی پێ بەخشیوە، ئەویش بڕوات تەقوای خوای پێ بکات و سیلەی ڕەحمی پێ بگەیەنێت و ڕەچاوی مافەکانی خوای تێدا بکات، ئا ئەمەیان بەرزترین پلە و پایەی هەیە.

٢. هەروەها کەسێك خوای مەزن زانستێکی پێ بەخشیوە، ماڵی پێ نەبەخشیوە، بەڵام نیەتی پاکە؛ ئەڵێ: ئەگەر پارەم هەبوایە وەکو فلان کەسم دەکرد، جا بەپێی نیەتەکەی پاداشت دەدرێتەوە، لە ئەجریشدا وەکو یەك وان.

---

(١) أخرجه الترمذي في «جامعه» (٢٣٢٥)، وابن ماجه في «سننه» (٤٢٢٨)، وأحمد في «مسنده» (١٨٣٠٩). وقال الترمذي: «حسن صحيح». وحسنه شعيب الأرناؤوط وصححه الألباني.

٣. هەروەها کەسێك خوای مەزن ماڵ و سامانی پێ بەخشیوە، زانستی پێ نەبەخشیوە، ئەڕوا بە هەوەس و هەوا و ئارەزوی خۆی و بە بێ عیلم دەیبەخشێتەوە، نە لە خوا دەترسێت دەر هەق ئەو پارەیەی لە لایەتی، نە سیلەی ڕەحمی پێ دەگەیەنێت، نە ڕەچاوی مافەکانی خواش دەکات تێیدا، جا ئا ئەمە لە خراپترین پلەدایە.

٤. هەورەها کەسێك خوای مەزن نە ماڵی پێ بەخشیوە نە زانست، جا ئەڵێ: ئەگەر پارەم هەبوایە وەك فلان کەسم دەکرد لە خراپە، ئەمیش بە نیەتی خۆی لەگەڵیدا دەکرێت، و لە تاوانیشدا وەکو یەك وان».

**سودێك:**

ئەم فەرمودەیە گەورەیی و گرنگی زانستمان بۆ دەر دەخات، دەبینی لە هەر چوار حاڵەتەکەدا هۆکارەکە زانستە، کە چاکە بەهۆی عیلمەوەیە، کە خراپە بەهۆی نەبونی عیلمی شەرعیەوەیە:

کەسی یەکەمیان: ماڵ و **زانستی پێ بەخشیووە.**

کەسی دووەم: **زانستی پێ بەخشیووە**، ماڵی پێ نەبەخشیووە.

کەسی سێیەم: ماڵی پێ بەخشیووە، **زانستی پێ نەبەخشیووە.**

کەسی چوارەمیان: **نە زانستی پێ بەخشیووە** نە ماڵ.

**ب- هەروەها دانەنان بە تاوانندا:**

چونکه ناکرێت مرۆڤ تەوبە بکات لە شتێك و بە تاوانی نەزانێت، هەر بۆیە ئەبێت دان بە هەڵەی خۆیدا بنێت.

هەر وەك لە فەرمودەکەی عائیشەدا هاتوە لە صەحیحی بوخاریدا، پەیامبەری خوا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ پێی فەرموە: «يَا عَائِشَةُ إِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي الله وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ». «ئەی عائیشە ئەگەر تاوانێکت توش هاتووە، داوای لێ خۆشبون بکە لە خوا و تەوبە بکە، چونکە ئەگەر بەندە دان بە تاوانەکەی خۆیدا بهێنێت و پاشان تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەر دەگرێت».

**ج- ئەبێت تەوبەکە لە کاتێکدا بێت قەبوڵ بکرێت:**

کە بریتیە لە پێش سەرە مەرگ و پێش هەڵ هاتنی خۆر لە ئاواوە.

ئەمەش لە حەدیسەکەی ئیبن عومەردا هاتووە، پەیامبەری خۆشەویستمان عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ»[1]. «بە ڕاستی خوا تەوبەی بەندەکانی قەبوڵ دەکات، هەتا پێش سەرە مەرگ».

---

(١) أخرجه الترمذي في «جامعه» (٣٥٣٧)، وابن ماجه في «سننه» (٤٢٥٣)، وأحمد في «مسنده» (٦٢٦٩، ٦٥١٩)، وعبد بن حميد في «المنتخب» وأبو يعلىٰ في «مسنده» (٥٦٠٩).

قال الترمذي: «هذا حديث حسن غريب». وصححه النووي وحسنه الألباني ومحققو المسند.

هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە لە حەدیسەکەی ئەبو موسای ئەشعەری، پەیامبەری خوا عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا»[1]. «بەڕاستی پەروەردگاری پایە بەرز، بە شەو دەستی ڕا دەخات بۆ ئەوەی تاوان کارانی ڕۆژ تەوبەی لا بکەن، و بە ڕۆژ دەستی ڕا دەخات بۆ ئەوەی تاوان کارانی شەو تەوبەی لە لادا بکەن، هەتا ئەو کاتەی خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵ دێت».

❁ ❁ ❁

(١) أخرجه مسلم في «صحيحه» (١٧٩).

# نیشانەکانی قەبوڵ بوونی تەبوبە

**برای خۆشەویستم... خوشکی بەڕێزم**

چەند نیشانەیەك هەیە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە تەوبەکەت قەبوڵ بووە و گەڕانەوەیەکی ڕاست و پاکت ئەنجامداوە، لەوانە:

## یەکەم: پاش تەوبە کردنەکەی باشتر بێت وەك لە پێشتر

ئەمەش هەموو کەسێك هەستی پێ دەکات، و بەخۆی دەزانێت، کە ئێستا باشترە وەك لە پێشتری یان نا، خۆ ئەگەر باشتر بوو ئەوا سوپاس و ستایشی خوای مەزن بکات کە سەرکەوتوی کردووە و تەوبەکەی لێ وەر گرتوویت، با بشپارێتەوە بەشکو خوای مەزن بەردەوامی بکات، چونکە لە تەوبە گرنگتر بریتیە لە بەردەوام بوون. خۆ ئەگەریش وا نەبوو ئەوا با لۆمەی خۆی بکات و هیممەتێك بکات بۆ زیاتر بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن، چونکە ئاماژەی خراپن بۆ ناڕاستێتی تەوبە کردنەکە.

## دووەم: ئەبێت بەردەوام ترسی لێ نەبڕێت

لەوەی کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ تاوان کردن، لەوەی کە خوای مەزن تۆڵەی ئەو تاوانانەی پێشوی لێ بکاتەوە...

ئەبێت بە بەردەوامی بترسێت و ئەمین نەبێت لە خەشم و قینی خوای مەزن -پەنا بەخوا، لە خەشم و قینی خوا-، چونکە مرۆڤی ژیر لە سزای

پەروەردگاری بێ ئاگا نابێت، ئەمەش حاڵیەتی تا ئەو دەمەی فریشتەکان پێـــی دەڵـــێن: ﴿أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ۝٣٠﴾ [فصلت:٣٠]. «مەترسێن و هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت، مـژدەی ئـەو بەهەشتانەتان لێ بێت کە بەڵێنتان پێ دەدرا». ئیتر ئا لەوێ ترس و بـیم و غەم و پەژارەکەی نامێنێت.

## سێیەم: ئەبێت دوای تەوبەکردنیش بەگەورە تەماشای تاوانانەکانی بکات

بەڵێ، ئەبێت بە گەورە تەماشای تاوانەکانی بکـات، چ ئەوانـەی کـە ئەنجامی داوە و تەوبەی لێ کردوە، چ ئەوانەی کـە نەفسـی و شـەیتان و هەوا و ئارەزوی داوای لێ دەکەن ئەنجامی بدات...

ئیبن مەسعود -ڕەزای خـوای لێبێـت- ئەفـەرموێ: «إِنَّ الْمُـؤْمِنَ يَـرَىٰ ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِـدٌ تَحْـتَ جَبَلٍ يَخَـافُ أَنْ يَقَـعَ عَلَيْـهِ، وَإِنَّ الْفَـاجِرَ يَـرَىٰ ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَـىٰ أَنْفِـهِ فَقَـالَ بِـهِ هَكَـذَا» «بـاوەڕدار تاوانـەکانی وەك کێوێـك دەبینێت بەسەر سەریەوە بێت، دەترسێت دا بکەوێت بـە سـەریدا، بـەڵام خراپە کار و مونافیق تاوانەکانی بە مێشولەیەك دەبینێت، بە لای لـوتی تێ بپەڕێت، ئەویش بە دەستی ئاوهایەکی لێ بکات، بفڕێت».

هەندێك لە سەلەف -ڕەحمەتی خوایان لێبێـت- فەرمویانـە: «لَا تَنْظُـر إِلَـىٰ صِغَرِ المَعْصِـيةِ وَلَكِـنِ انْظُـر إِلَـىٰ مَـنْ عَصَـيْت» «تەماشـای بچـوکی

تاوانەکە مەکە، بەڵکو تەماشای گەورەیی ئەو خوایە بکە کە سەرپێچیت کردووە».

هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لیٚ بیٚت-، ئەڵیٚت: «بەڕاستی ئیٚوە هەندیٚك شت دەکەن لە تاڵە موو باریکترە لە پیٚش چاوتان، بەڵام ئیٚمە لە سەردەمی پەیامبەری خوادا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ ئا ئەو جۆرە کارانەمان بە تاوانە لە ناو بەرەکان دەزانی».

ئەوە ئەنەسە یەکیٚکە لە یارانی پەیامبەری خوایە عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ، بە شویٚنکەوتە بەڕیٚزەکان ئاوها ئەڵیٚت، لە کاتیٚکدا پەیامبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی شایەتی چاکەی بۆ ئەو سەردەمە پاکە داوە هەروەك لە هەر دوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە حەدیسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و عیمرانی کوڕی حوصەین و ئەبو هورەیرەوە، کەوا پەیامبەر ﷺ فەرمویەتی: «خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[1]، «باشترینی ئوممەتەکەم ئەم خەڵکانەی سەردەمی منن پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دیٚن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دیٚن».

(١) أخرجه البخاري في «صحيحه» (٢٦٥١)، ومسلم في «صحيحه» (٢٥٣٥).

ئەگەر ئەنەس -ڕەزای خوای لیٚ بیٚت- بەو سەردەمە پاکە وا بلیٚت، باشە ئەمڕۆی موسلٚمانان ببینیٚت چی ئەفەرمویٚ؟! خـوای مـەزن پـیٚ چەسپاو ودامەزراومان بکات لەسەر هەق.

## چوارەم: ئەبیٚت تەوبە کردن، تۆبەکار دلٚ شکاو و مل کەچ و بیٚ فیز بکات بەرانبەر بە پەروەردگارەکەی

هیچ شتیٚك لەوە خۆشەویستتر نیە لـە لای خـوا کـە بەنـدە بـە دلٚ شکاوی و لاوازی و مل کەچیەوە بگەڕیٚتەوە لای، بـە دلیٚکـی تـەڕ و پاراو بە زیکری خوا، بە بیٚ خۆپەسەندی و لە خۆ بایی بوون، بـە بـیٚ حەز کردن لە ستایش، بە بیٚ بە کەم تەماشـاکردنی خـەلٚك بـە هـۆی تاوان و سەرپیٚچیانەوە.

ئا ئەمەش هەقیقەتی تەوبە کردنە، ئەوەنـدە دەترسـیٚت لـە سـەر ئەنجامی خراپی ئەو کارەی لیٚی وەشاوەتەوە وەختە دلٚی دەر دەچـیٚت، جا هەر کەس لە دونیا، نەترسیٚت و دلٚی نەشکیٚت بـۆ ئەوانـەی لیٚـی وەشاوەتەوە، لە ئاخیرەتدا دەبیٚت بترسیٚت و دلٚی بشـکیٚتەوە، چـونکە دلٚ هەر ئەبیٚت بشکیٚتەوە جا یا لە دونیایە یا لە ئاخیرەت، ئیتر هـەر کەسیٚك ئەمەی لە خۆ نـەبینی بـا تەوبەکـەی تۆمـەت بـار بکـات و هەولٚی ڕاست کردنەوەی بدات.

هـەر بۆیـە پەیامبـەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفـەرمویٚت - هەروەك لە صەحیحی موسـلیمدا لـە حەدیسـەکەی ئـەبو هـورەیرەوە

هـــاتوه-: «أَقْـرَبُ مَـا يَكُـونُ الْعَبْـدُ مِـنْ رَبِّـهِ وَهُـوَ سَـاجِدٌ فَـأَكْثِرُوا الـدُّعَاءَ» «نزيکترين ساتی بەندە لە خــوای مەزنـــەوە ئـــەو کاتەيـــە کـــە ســـوژدە دەبات، هەر بۆيە زۆر دوعا بکەن، زۆر بپاڕێنەوە».

چونکە لە ئەو کاتەدا بەندە شەريفترين و بەڕێزترين شوێنی لاشـــەی کە سەريەتی ئاوها کەچی کردوە و داينوانـــدوە بـــۆ پەروەردگارەکـــەی، لەسەر زەوی داناوە، ئەو زەويەی کە ئەم پێی لەسەر دادەنێت، کە لـــە ئەو پەڕی زەليلی دايە، هـــەر بۆيـــە لەبـــەر زەليليەکـــەی خـــوای مـــەزن دوعـای گیرا دەکات -خوای بیسەر و بینا دوعای ئێمە و ئێوەش گـــيرا بکات-.

چەند خۆشە بە ئەو پەڕی زەليلی و مل کەچی و دڵ شکاويەوە بڵێ:

«أَسْأَلُك بِعِزِّك وَذُلِّي إِلّا رَحِمْتَنِي، أَسْأَلُك بِقُوَّتِك وَضَعْفِي، وَبِغِنَاكَ عَنِّي وفَقْرِي إِلَيْك. هذِهِ نَاصِيَتِي الكَاذِبَة الخَاطِئَة بَيْنَ يَدَيْك، عَبِيدك سِوَاي كَثِير ولَيْس لِي سَيِّد سِوَاك. لَا مَلْجأَ ولاَ مَنْجَىٰ مِنْكَ إِلّا إِلَيْك. أَسْألك مَسْألة المَسَاكين. وأَبْتَهل إِلَيْك ابْتِهَال الخَاضِعِ الذّلِيل. وأَدْعُوكَ دُعَاءَ الخَائِفَ الضَّرِير، سُؤَالَ مَنْ خَضَعَتْ لَك رَقَبَته، ورَغِمَ لَكَ أَنْفُه، وفَاضَتْ لَكَ عَيْنَاه، وذَلَّ لَكَ قَلْبه». پەروەردگارا! لێت دەپاڕێمەوە بە دەسەڵاتداری خـــۆت و بێ دەسەڵاتی خۆم، لێت دەپاڕێمەوە بە بەهێزی خۆت و لاوازی خـــۆم، لێت دەپاڕێمەوە بە بێ نيازی تۆ بە من و نيازمەندی من بـــە تـــۆ، بـــە

هــەژاری مــن و دەوڵەمەنــدی تــۆ... ئــەوە نێــو چــاوانە درۆزنــە هەڵەکارەکەی منە لەبەر دەستی تۆدا، بەندەی جگـە لـە منـت زۆرە، بەڵام من جگە لە تۆ شـك نابـەم وکەسـی تـرم نیـە، هـیچ پەناگـە و حەشارگەیەکم نیە مەگەر هەر بۆلای تۆ نەبێت ئەی پەروەردگارا! لێت دەپاڕێمەوە بە پاڕانەوەی هەژاران...

## پێنجەم: ئەبێت ئاگاداری ئەندامەکانی لاشەی بێت

ئەبێت ئاگاداری زمانی بێت؛ لە درۆ کردن و غەیبەت و فیتنەیی و وتی وتی و قسەی زیادە و قسە هێنان و بردن. ئەبێت سەرقاڵی بکات بە زیکر و قورئان خوێندن و قسەی خێر و فەرمان بە چـاکە و ڕێگـری کردن لە خراپە.

هەروەها ئاگاداری سنگی بێت، هــەر چــی حەڵاڵــە ئــەوە بخــوات. ئاگاداری چاوەکانی بێت تەماشای حــەرامی پــێ نــەکات. ئاگــاداری گوێی بێت ئــەوەی حەرامــە گــوێی بــۆ نــەگرێت، وەکــو درۆ کــردن و غەیبەت کردن و گۆرانی و مۆسیقا و...

هەروەها ئاگاداری دەستەکانی بێت لــە بــۆ شــتی حــەرام درێــژیان نەکات. ئاگاداری هەر دوو پێی بێت و بەرەو حەرام پێی نەڕوات.

له هەمووی گرنگتر: ئاگاداری دڵی بێت، لە ڕیا و ڕق و بوغز و حەسودی و غەش و نیفاق و خۆشویستنی دوژمنانی خوا و ڕق لێ بوونی دۆستانی خوا و... هتد بە دووری بگرێت.

چونکە دڵ پادشایە و ئەندامەکانیش سەربازی ئەو پاشەیەن، سەربازەکان بە پێی ڕێنمایی ئەو پادشایە هەڵس و کەوت دەکەن، هەر بۆیە پەلاماری عەرشی پاشایەتی بدە و خۆت بە سەربازەکانەوە سەرقاڵ مەکە، چاك کردنی پادشاکە بێگومان چاك بونی سەربازەکانی لەگەڵدایە.

ئاگاداری سەرجەم پەرستنەکانی بێت، پاك و ساغ و بێ خەوشی بکات بە تەنها بۆ خوای مەزن، دوور بکەوێتەوە لە ڕیابازی و ناو پەیدا کردن.

## ئاگاداربە! تەوبەکردن دوا مەخە

ئاگادار بە! تەوبە کردنەکەت دوا مەخە و تەسویفی تێدا مەکە، (سَوْفَ)ش، واتە: دوایی، پاشان، ئینجا، پاش وەخت، دوای ئەوە،... هتد، لێرەشدا واتە: دواخستنی تەوبە بۆ کات و ساتێکی تر.

**خوشکی بەڕێزم... برای خۆشەویستم**

مەڵێ: دواجار تەوبە دەکەم، بێگومان کەس نازانێ کەی ئەجەلت دێت وچەند لە تەمەنت ماوە.

ئەوەی جێی داخە خەڵکانێك دەبینین «دوایی» بۆ تەوبە کردن ئەکەن و ئەڵێن:

ئێستا کاتی تەوبە کردن نیە، واز بهێنن با هەندێك چێژ لە دونیا وەر بگرین.

هەر کە بە ساڵدا چووین خۆمان تەوبە دەکەین، خۆ قابیلە چی ئەکەین؟! دوا جار هەر تەوبە ئەکەین، بەس جارێ وەختی نیە!

جارێ با فلانە شت بکەم، پاشان نوێژ دەکەم!؟

با فلانە شەهادە بە دەست بهێنم پاشان ڕۆژوو دەگرم؟!

با ناجح ببم پاشان ئەوە دەکەم؟!

با زانکۆ یان پەیمانگا تەواو بکەم، یان با شوو بکەم، پاشان سەر پۆش دەدەم و دەبم بە بالا پۆشێکی چاك[1]؟!

(١) لێرەدا تێبینیەکی زۆر گرنگ هەیە لەسەر مەفهومی حیجاب وبالا پۆش، بەڵکو لە ڕاستیدا پێویستی بە کتێبێکی تایبەت هەیە تا بە دوور و درێژی باسی لێوە بکرێ.

جا چەندیش حەز دەکەم کە هەموو ئوممەتی موحەممەد صلیٰ الله علیه وآله وسلم گوێیان لەم وتەیە ببوایە، بە تایبەت مللەتە ئازیزەکەی خۆم، هەر چۆن بێت لێرەدا پشت بەخوا لە چەند دێڕێکدا دەیگوشێرم و عەرزی خزمەتتانی دەکەم:

سەرەتا ئەبێت ئەوە بزانین ئافرەتان لە شەرعدا بە دوو شت خۆیان دادەپۆشن:

یەکەم: بە خیمار ئەمەش بۆ داپۆشینی سەر و سنگیان بە تەواوەتی.

دووەمیان: کە بۆ باقی لاشەیانە بە جیلباب یا هەر شتێکی تر مواصەفاتی جیلبابی تێدا بێت.

بالا پۆشیش بەوە دەوترێ کە پۆشتە و داپۆشراو بێت لە ئاست بەرانبەرە نامەحرەمەکانیدا، هەر وەك خوای کار بەجێ فەرمان دەکات بە ئافرەتانی موسڵمان جێ بە جێی بکەن.

حیجاب خۆی وشیەکی عەرەبیە: واتە: پەردە، داپۆشین..

لە شەرعیشدا وەك لە واتا زمانەوانیەکەوە بۆمان دەردەکەوێت، حیجاب بریتیە لە: شاردنەوە و داپۆشینی جوانی لاشە لە لایەن ئافرەتانەوە لە ئاست نامەحرەمەکانی خۆیان. «جگە لە دەم و چاو و هەردوو دەست نەبێت - ئەگەرچی ڕای پەسەند ئەوەیە: دەست و دەم وچاو پێویستە داپۆشراو بێت ئەگەر مەترسی فیتنە هەبوو».

جا ورد بەرەوە، خوشکی ئەزیزم... نەموت: شاردنەوەی موی قژی بە تەنها، ئەگەریش جار و بار هەندێکیشی بەدەر کەوت قەیدی نیە، نا.. وا نەوتراوە.

کە وابوو هەر ئافرەتێك لەچکێکی دا بەسەردا ئەوە مەرج نیە موحەجەبە بێت. پەنتۆڵێکی تەسکی لە پێ کردووە و پارچە پەڕۆیەکیشی هەروا داوە بەسەریدا، ئەمە بە

هیچ شێوەیەك پێی ناوترێت موحەجەبە، شتی واش لە شەریعی خوادا جل جلالە نەبووە و نابێت و جێی نابێتەوە.

یان لەچکێك دەدات بەسەردا و تەنورەیەکی تەسکی لە پێ کردووە یان قەمیسێکی تەسك یان...

ئاخر یەکێك لە **مەرجەکانی حیجاب** ئەوەیە ئەبێت هەموو لاشە داپۆشێت -کە عابای کوردەواری یان هەر کراس وجل و بەرگێك بالاَّ پۆش بێت- نەتان بیستووە دوژمنان هەر لە کۆنەوە کە درکیان بە پۆشتەیی عابا و بالاَّ پۆشی کردووە کەوتنە دژایەتی کردنی و ویستویان نەمێنێ و شیعریشیان لەسەر وتوە:

... باوی عابا نەماوە * جلی کوردی زۆر جوانە شۆڕە و پەسەند کراوە

تەماشای شەیتان بکەن بە ناوی شۆڕی و پۆشتەیی و جلی نەتەوەییەوە، ئەیەوێ دایکان و خوشکانمان دا بڕنێت لە بالاَّ پۆشی، لە کاتێکدا عاباش ئەویش هەر جلێکی کوردی ڕەسەنە، بالاَّ پۆشیش کولتوری کۆن ودێرینی کوردەواریە.

بەلاَّم ئەفسوس: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾.

**هەروەها** یەکێکی تر لە مەرجەکانی حیجاب ئەوەیە ئەبێت تەسك نەبێت.

**هەروەها** تەشبیهی جولەکە و گاورەکانیش نەبێت.

**هەروەها** تەشبیهی پیاوان نەبێت.

**هەر بۆیە** حیجاب «سەرپۆش» ئەبێت بەناوی خۆیەوە بێت، سەر بە تەواوەتی داپۆشێت لەگەڵ تەواوی سنگدا، ئەمەش لە زمانی عەرەبیدا «خیماری» پێ دەگوترێ، واتە: دا پۆشین، بە عارەقیش بۆیە دەوترێت «خەمر»، چونکە عەقڵ دادەپۆشێ و لە هۆشی خۆی نایهێلێت. ئەگەریش خوا ویستی هەبوو لە جێگای خۆی زیاتر باسی لێوە دەکرێ. والله تعالىٰ أعلم وهو الموفِّق.

بەڵام چەندەهامان بینی پێش ئـەوەی هـیچ لەمانـە تـەواو بکـات کۆچیان کرد، کۆچی هاندەران ناڵێم...

نا بە خوا...

بەڵکو کۆچی هەتا هەتایی لەم دونیاد ئەڵێم.

ئێستاش لە ژێر خاکن و ناویشیان هەر نەما. بەڕاستی ئەمانە فێڵ و تەڵەکەی شەیتانن و فرت و فێڵی ئەم دونیا فانیەیە.

جا شەیتان دێت وەعدی نەمرێتی بە ئنسان دەدات، کەچی ئەوەشی بە دەست نیە.

بۆیـە ئـەی تەوبـەکاران دەسـت پێشـخەری بکـەن، دەسـت پـێش خەری... وریا بن وریا... لە بێ ئاگایی، لـە دواخسـتنی تەوبـە، لـە هیوا درێژی، چونکە بەڕاستی ئەگـەر هیـوا درێـژی نەبوایـە هـەرگیز فەرامۆشکردن و پشت گوێخستن نەدەما.

**هەر بۆیە برا ئەزیزەکەم.. خوشکە بە شەرمەکەم**

خێراکە لە بۆ تەوبەکردن، ئاگاداری دواخسـتنی تەوبـە کـردن بـە، چونکە ئەوە خۆی بۆ خۆی تاوانێکە و پێویستی بە تەوبەکردنە.

هەر بۆیە دەست بەجێ تەوبە بکە، پێش هاتنی ئەجەلەکەت، پێش ئەوەی هەر چی هیوا و ئاواتت هەیە هـەموی ببڕێتـەوە و نـەمێنێت، تەوبە بکە، پەشیمانی بکێشە، بگەڕێوە.

ئاخر تۆ نازانی کەی دوارِۆژتـە؟! کـەی دوا هەناسـەتە؟! کـەی دوا شەوتە؟! کەی دوا قسەتە؟! کەی دوا چونتە؟! کەی دوا هاتننتە؟!

بگەڕیوە پێش ئەوەی تاریکی باڵ بەسـەر دڵەکەتـدا بکێشـێ، وای لێبێ چڵك و ژەنگی تاوان دایبپۆشێت، وای لێبێت سڕینەوەش قـەبوڵ نەکات، بگەڕێوە پێش ئەوەی نەخۆشی یان مردن هێرش بەرنە سەرت، ئەو کاتە دەرفەتی تەوبە کردنیشت نەمێنێت.

۞ ۞ ۞

## فریو مەخۆ بە داپۆشینت لەلایەن خواوە و بەردەوامی ناز ونیعمەتەکانی! ﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ﴾

هەندێك ڕۆچوون لەتاوان و سەرپێچیدا، کاتێکیش لە سەر ئەنجامەکەی بێداری دەکەیتەوە و ئامۆژگاری دەکەیت، ئەڵێت:

ئەی خۆ چیمان کردووە؟! خەڵکانێك بۆ بە ئاشکرا تاوان دەکەن بەرانبەر بە خوا، خوا چاك دەیانبینێت؟! ئەسڵەن زەوی هەموی پڕ بووە لە تاوانی ئەوان، کەچی لە خۆشگوزەرانیدا دەژین چ خۆشگوزەرانیەکیش؟!

بەڵام ئەمانە لە بیریان ڕۆیشتۆتەوە، کە خوا دونیا ئەبەخشێتە ئەوەی خۆشی ئەوێت و ئەوەشی خۆشی ناوێت، بەڵام ئاخیرەت تەنها بە کەسێك دەبەخشێت کە خۆشی بوێت.

خۆ ئەگەریش بینیت کەسێك سەرپێچی خوا دەکات، خوای کار بەجێش پێی دەبەخشێت و بۆی زیاد دەکات، بزانە ئەوە ئیستدراجی خواییە «پلەپلە پەلەکێش کردنێتی» بۆ زیاتر تاوان کردن و ڕۆچون تیایدا، بەڵام هەر کە لێیانی گرت و سزای دان، ئەو کات بە هیچ شێوەیەك لە دەستی دەر ناچن.

پەیامبەری خوا صلیٰ الله علیه وآله وسلم دەفـەرمویت[1]: «إِذَا رَأَيْتَ اللهَ يُعْطِي الْعَبْدَ مِنْ الدُّنْيَا عَلَىٰ مَعَاصِيهِ مَا يُحِبُّ فَإِنَّمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ ثُمَّ تَلَا رَسُـــــــولُ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾» [الأنعام:٤٤]. «ئەگەر بینیت، خوا لە دونیادا ئەوە دەبەخشێتە بەندەیەك و بەندەكەش دڵی پێ خۆش دەبێت، سەر باری ئەوەش هەر سەرپێچی دەكات، ئەوە بزانە ئیستدراجە بەرە بەرە پەلە كێش كردنیەتی بۆ زیاتر تاوان كردن و ڕۆچوون تیایدا، پاشان پەیامبەری شیرین صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو فەرمایشتەی پەروەردگاری خوێندەوە: {جا كاتێك ئەو بەرنامە و ڕێبازەی یادیان خرابووەوە فەرامۆش كرد، دەروازەكانی هەموو شتێكمان بۆ كردنەوە لە جوانی دونیا و ماڵی دونیا زۆرمان پێ بەخشین، تا كاتێك دڵخۆش بوون بەوەی پێیان بەخشرا، لە ناكاو لێیانمانگرتن و سزایانماندا، ئیتر ئەوانیش بێ ئومێد و سەرگەردان بوون، پاشان ئەو گەلەی ستەمیان كرد دوا بڕاو و بن بڕ كران، و سوپاس و ستایشیش هەر بۆ خوای خاوەن جیهانەكانە}».

(١) أخرجه أحمد في «مسنده» (١٧٥٨٤)، والطبراني في «الكبير» (٩١٣، ٩١٤)، والطبراني في «الأوسط» (٩٢٧٢).

وحسنه العراقي والألباني في «الصحيحة» (١/ ٧٧٣) (٤١٣)، ومحققو المسند (١٧٣١١)

# لەکۆتاییدا

ڕا بکە و بڕۆ بەرەو خوا... ڕا بکە لە دەست هەوا و ئـارەزوو... ڕا بکە لە دەست سەرپێچی کردن... ڕا بکە لە دەست تـاوان... ڕا بکـە لە دەست شوبوهات... ڕا بکە لـە دەسـت شـەهەوات... ڕا بکـە لـە دەست دونیا هەمووی.

ڕوو بکە پەروەردگارت، بگەڕێوە، پاشگەز ببەوە، پەشیمان ببەوە، تەوبە بکە، با تاوانەکانیشت زۆر بن، با گەورەش بن، چونکە بـەزەیی و لێ خۆش بوونی پەروەردگار لە تاوانەکانت تۆ گـەورەترە، بـە شـەو دەستی ڕادەخات تا ئەوانەی بە ڕۆژ تاوانیـان کـردوە تەوبـە بکـەن و ئەویش لێیان خۆش بێت، بە ڕۆژیش دەستی ڕا دەخات تا ئەوانەی بـە شەو تاوانیان کردوە تەوبە بکەن و ئەویش لێیان خۆش بێت.

دە بـرام... خێـرا بکـە، خوشـکم هەسـتە بـەرەو ڕەحمـەت و لـێ خۆشبویی خوا، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت.

داواکارم لە پەروەردگار من و تۆش لەوانە بگێڕێـت کـە بەڕاسـتی تەوبە دەکەن، بەڕاستی ڕوو دەکەنە خوای پـەروەردگار، بەڕاسـتی بـۆ خوا دەسوڵحێن، خوای مەزن ئەم کارە بۆ من و بۆ تۆی خوێنەریش کە کاتێکی خۆتـت بـۆ خوێندنـەوەی تـەرخان کـرد بکاتـە مایـەی لـێ

خۆشبون، بیکاتە مایەی قورس کردنی میزانی حەسەناتمان، بە فەزڵ و کەرەم و لوتفی خۆی.

سوپاس وستایش هەر شایستەی خوایەی خاوەن شکۆیە، وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمَينِ، وصَلَىٰ اللهُ عَلَىٰ نَبِيِّنَا مُحَمَّد، وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم.

۞ ۞ ۞

# پێڕست